له بڵاوکراوەکانی پرۆژەی مەشخەڵی ڕێ
( ٦ )

# ئازاری مسوڵمانان له جیهاندا

ئامادەکردنی
زانا قەرەداغی

١٤٣٥ ك ٢٠١٣ ز

ناوی کتێب: ئازاری موسڵمانان له‌ جیهاندا

ئاماده‌کردنی: زانا قه‌ره‌داغی

چاپخانه‌: زانا

تیراژ: ٥٠

نۆره‌ی چاپ: یه‌که‌م

ژماره‌ی سپاردن: ( ١٥٩ ) ی به‌ڕێوه‌به‌رێتی گشتی کتێبخانه‌ گشتییه‌کانی وه‌زاره‌تی ڕۆشنبیریی

له‌ بڵاوکراوه‌کانی پرۆژه‌ی مه‌شخه‌ڵی ڕێ — ٦ -

**پێشەکییەك بە پێنووسی ئەحمەد ڕەنجبار..**

کاتێ سەیری جیهانی ئیسلامی دەکەین بە گشت نەتەوە و رەنگ و دەنگ لە تەواوی خاکی و گشت وڵاتانی یەوە، دەبینین تەواوی مسوڵمانانی ئەم جیهانە فراوانە کەتوونەتە ژێر باری ژێردەستەیی دوژمنانیان و بەتەواوی هۆکارەکانی بەگژداچوونەوەو لەناوبردنیان هەوڵ دەدرێت.

مسوڵمانان بۆ چەندین سەدە بوون بە هۆکاری بەختەوەری و سەرفرازی میللەتانی تری دونیا، ئەی مەگەر مسوڵمانان چرای شارستانیەتیان نەگەیاندە ئەندەلوس و غەرناتە و رەی؟! ئەی مەگەر مسوڵمانان ئیمپراتۆرییەتە ستەمکارەکانی (فارس) و (رۆم) یان نەڕوخاند و تەواوی گەلانی دونیایان لە ستەمی ئەوان رزگار نەکرد؟!

ئەی مەگەر ئیسلام نەبو بەرنامەو یاسارێژی کرد بۆ هەڵوەشاندنەوەی یاسای کۆیلەداریی و ئازادکردنی مرۆڤەکان لەو بەند و باوی کۆیلەییەی کە وەك ئاژەڵ سەیر دەکران؟

ئەی مەگەر ئیسلام نەبوو ئافرەتی لە زیندەبەچاڵکردن رزگار کرد و لە ماف و ئەرکی خواپەرستی دا بەرامبەر بە پیاو رای گرت؟

ئەی مەگەر ئیسلام صەڵاحەدینی ئەیوبی پێ نەگەیاند، کاتێ سەردەکەوێ بەسەر خاچدروشمەکانداو قودسی پیرۆزیان لێ وەردەگرێتەوە و هەموو خەڵکەکەی - واتە مەسیحییەکان - ئازاد دەکات و دەیان نێرێتەوە بۆ ئەوروپا، لە کاتێکدا ئەوان کاتێ هاتن هەزارەها مسوڵمانیان کوشت و بڕ کردبوو؟!

هەر بۆیە بە درێژایی ئەو سەدانەی کە ئیسلام فەرمانڕەوایی کردووە مرۆڤایەتی لە ئارامیدا بووە.

کەچی ئێستەش دوای ئەو مێژووە زێڕینە، نەوەکانیان لە تەواوی سەرزەوی وڵاتانی تایبەت بە خۆیان کەوتوونەتە ژێر چەوسانەوە و لەناوبردن ووێران بوونی وڵات و خاك و ئاویانەوە!

هەریەك لە ئێمەی مسوڵمان ئەوە دەزانین کە برایانی موسڵمانمان لە تەواوی دونیادا لە ئازاردان.

بەڵام بۆ زانینی کێشە و کەموکوریی و ژمارەی مسوڵمانان لە ووڵاتانەدا کە دەچەوسێنرێنەوە، تەنها کتێبی (ئازاری موسڵمانان لە جیهاندا) کە برای بەڕێز کاك زانا قەرەداغی ئامادەی کردووە و ماندوبوونێکی زۆری لەگەڵدا کێشاوە، بەسە بۆ روونکردنەوەیان.

من ئەوکات کە کاك زانام ناسی لە بەشی رۆژنامەگەری بزووتنەوەی ئیسلامی بووم.

ئێستایش زیاتر دڵخۆشم کاتێ لە تۆڕی ئینتەرنێت داو لە رۆژنامەی باسك دا ناو و نوسینە بەپێزەکانی دەبینم.

جارێکی تر دەستخۆشی لە کاك زانا قەرەداغی دەکەم و داواکاریشم لە خوێنەران بە چاوی گرنگی پێدانەوە لە بابەتەکەی بڕوانن و ئاخ و حەسرەتێك بۆ دونیای موسڵمانان هەڵبکێشن.

ئەحمەد رەنجبار

# ئازاری موسڵمانان له تاجیکستان

- ولآتی ئیمامی تیرمیزی موحەددیسی گەورە -

تاجیکستان یەکێکە لە ولآتەکانی ئاسیای ناوەندو دەورە دراوە بەم ولآتانە لە ڕۆژهەلآتەوە تورکمانستانی ڕۆژهەلآت لە باکورەوە قیرغیزستان لەباکورو باکوری خورئاواوە ئۆزبەکستان(ئۆزبەکستان پێشتر بەشێك بووە لەخاکی تاجیکستان،بەلآم دواتر لێی جیاکرایەوە) لە باشورەوە ئەفغانستان.

زمان : تاجیکی و ڕوسی

ڕووبەری خاکەکەی : ١٤٣١٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشە

ژمارەی دانیشتوو:٧١٦٣٥٠٠ کەسە

پایتەخت: دوشنبا(لەسەردەمی داگیرکاری ڕووس ناونرابووستالین ئاباد)

دراو: سمۆنی تاجیکی

ڕەگەزەکانی تاجیکستان .تاجیکی٩. ٧٩٪

ئۆزبەکی: ١٥,٣٪

قرغیز:١,١ ٪

ڕوسی: ١,٥٪

ئاین :موسڵمان ٩٠ ٪

مەسیحی ئەرسەدۆکسی ٣٪

ئاینی تر: ٧٪

سەربەخۆیی:لە ساڵی ١٩٩١ سەربەخۆیی خۆی وەرگرت لە یەکێتی سۆفیەت.

## ئیسلام و تاجیکستان

تاجیکستان وەکو وڵاتەکانی ترئەمیش فتوحاتی ئیسلامی گرتییەوە،دوای فەتحی خۆراسان سوپای موسڵمانان بەرەودەریای جەیحۆن ڕۆشتن،لەوێشەوە دۆڵی فەرغانە فەتح کرا بەسەرکردایەتی قوتەیبەی کوڕی موسلیم سوپای موسڵمانان لەسەر فتوحات بەردەوام بووتا گەشتنە شاری کەشغەر لە نزیك وڵاتی چین. لەسەردەمی ئومەویی یەکان و عەباسی یەکان و دوای ئەوان سامانی یەکان و دواتر لەسەردەمی غەزنەویەکان ئاینی پیرۆزی ئیسلام گەیشتە وڵاتی هیند بەتایبەت لەسەردەمی سوڵتان مەحمودی غەزنەوەی ئاینی ئیسلام گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی،دوای ئەمان سەلجوقی یەکان هاتن دواتر مەغۆلەکان هاتنە سەر حوکم کاتێك سەلجوقی یەکان تەواو لاواز بوون.

کاتێك مەغۆلەکان لاواز بوون ڕووسەکان تەماحیان کردە خاکی موسڵمانان و زۆر هەوڵی داگیرکردنی ئەو ناوچانەیان دا بەتایبەت لەساڵی١٨٦٩،لە ساڵی ١٩١٧ دەست یان گرت بە سەر تاجیکستان و ساڵی ١٩٢٢ خرایە سەر یەکێتی سۆفیەت لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٠ گەلی موسڵمانی تاجیك دژی ڕووسەکان ڕاپەڕین و خاکەکەیان لە دەستی داگیرکەران ڕزگار کرد لەساڵی ١٩٩١ سەربەخۆیی خۆی وەرگرت لە یەکێتی سۆفیەت.

ئاواتی گەڕانەوەی ئاینی ئیسلام

هەرچەندە تاجیکستان بۆ ماوەی ٧٠ ساڵ بوو بەبەشێك لە یەکێتی سۆفیەت بەڵام خەڵکی موسڵمانی ئەو وڵاتە توانی بوویان پارێزگاری

لەشوناسی ئیسلامی خۆیان بکەن و هەرکە تارمایی شیوعیەت نەماو یەکێتی سۆڤیەت هەڵوەشایەوە ئیتر خۆری ئیسلام سەری بەهەموو قوژبنێکی وڵاتی ئیسلام خوازی تاجیکستان دا کرد،بەڵام پاشماوەی شیوعیەکان توانیان سەرۆکایەتی وڵات بگرنەوە دەست کە ئەمە کێشەی هەموو وڵاتە ئیسلامی یەکانە کەمینەیەکی بێ دین حوکمی زۆرینەیەکی موسڵمان ئەکەن.

لەساڵی ١٩٩١ ڕەحمان نبییڤ بوو بەسەرۆکی وڵات کەکەسێکی شیوعی بوو سەربەتەیاری برجێنڤ بوو کە ڕووسییەکی زۆر توندڕەو بوو.لە ساڵی ١٩٩٢ شەڕ لە نێوان گەل و دەسەڵاتدا دەستی پێکرد گەل داوای گەڕانەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامییان ئەکرد بۆ سەر شانۆی دەسەڵات.لایەنە بەرهەڵستکارەکان توانییان حکومەت ناچار بکەن بەپێك هێنانی حکومەتێکی ئیتیلافی هەشت وەزارەت بۆ بەرەی بەرهەڵستکار بێت،بەڵام لایەنی شیوعی کەکەمینەیەك بوون و بەفیتی ڕووسەکان ئیشیان ئەکرد ڕازی نەبوون بەدروست کردنی حکومەت و جارێکی تر شەڕ لە نێوان بەرەی ئیسلام خواز و حکومەت دروست بوویەوە سەرۆکی وڵات ناچار بوو کە دەست لەکاربکێشێتەوە و لە مۆسکۆ دابنیشت. ڕووسەکان بۆ یارمەتی شیوعییەکان جارێکی تر بە زەبری هێز ڕووبەڕووی خەڵکی ئیسلام خوازی تاجیکی بوونەوە.

عەلی ڕەحمانۆڤی هاوکاری نزیکی سەرۆکی پێشویان کرد بەسەرۆکی وڵات و بەهەزارەها کەس یان شەهید کردو وڵات یان وێران کرد.بەهۆی ئەم شەڕە ماڵ وێرانکەرەوە موسڵمانەکان توشی کوشتن وبڕین هاتن بەجۆرێك:

١- یەك ملیۆن کەس یان ئاوارە بوو.

٢-١٠٠ هەزار لەموسڵمانەکان کوژران.

٣-زیاتر له ٣٠٠ هەزارکەس بریندار کرا.

٤- بەسەدەها سەرکردەی ئیسلامی خرانه بەندینخانەوە.

دواتر حکومەت تەشکیل کراو دەستورێك که بەخواستی خەڵکی ئیسلام خوازی تاجیکی نەبوو دانرا هەرچەندە شیوعییەکان بۆ ماوەیەکی دووروو درێژ حوکمی تاجیکستان یان بەدەستەوە بوو زۆر هەوڵیان داوە بێ دینی و فکری شیوعی و خراپەکاری بڵاوبکەنەوە و گەلی موسڵمانی تاجیك له ناو گەلی ڕووسی دا بتوێننەوەو ئەو ماوە دوورو درێژە توانی بوویان ئەو نەوە تازە پێ گەشتوانه لەڕێگه خوێندنەوە واڵ بێ کەوێنەی ئیسلام یان لا ناشرین بکەن ئاینی ئیسلام بە دواکەوتوو و ئیرهاب و خورافه بزانن.زۆرێك لەلاوانی تاجیك وایان لێ هات بوو که هیچ شتێك یان دەربارەی ئاینی ئیسلام نەئەزانی تەنها بەناو ئەیانزانی ئیسلام هەیه بەلام لێ یان شێوێنرا بوو ئاینی ئیسلام یان له چەند شتێکی زۆر سادەدا ئەبینی زۆر ئاسایی بوو لایەن گۆشتی بەراز بخۆن و عارەق بخۆنەوە تێکەڵ بن له گەڵ ئافرەتان دا.جگه لەوەی هەڵمەتێکی گشتگیر هەبوو بۆ بەگاورکردنی ئەم گەله موسڵمانه،بەسەدەها ڕێکخراو ئیشیان ئەکرد تا بتوانن ئەم گەله موسڵمانه له ئاینی پیرۆزی ئیسلام دوور بخەنەوە.

## بزووتنەوەی ئیسلامی لەتاجیکستان

ئـــەم بزووتنەوەیـــە لـــە ســـاڵی ١٩٧٨ دامـــەزراوە بەدەستپێـــشخەری عبداللـەنوری و دواتـر باڵێکی سیاسی بـەناوی بزووتنـەوەی ڕاپـەڕینی ئیـسلامی لەسـاڵی ١٩٩٣ دائەمـەزرێت بەسـەرۆکایەتی محمدشـەریف همەت

ئـەم دوو پارتـە ئیـسلامی یـە جگـە لـە جیهـاد کـردن بـۆ گێڕانـەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ وڵات خەریکی  کاری بانگەوازی ئیسلامی و دروست کردنی مزگەوت و خزمەت کردنـی خـەڵکی سـتەم دیـدەی تاجیکستانن توانی وویانە بەشێوەیەکی زۆرباش گەشە بە ڕابوونی ئیسلامی بدەن و خەڵکی تاجیکستان لە ئاینەکەیان شارەزا بکەن.

# ئـــازاری موسڵمانان لە دۆڵی سوات

دۆڵی سوات هەرێمێکە ئەکەوێتە باکوری خۆرئاوای پارێزگای (صۆبە سەرحەد) لە پاکستان.

پایتەختی ئەم هەرێمە : سەیدۆ شەریف.

رووبەری خاکەکەی : ١٧٧٢ کیلۆمەترچوارگۆشەیە.

ژمارەی دانیشتوانەکەی :٢٢ ملیۆن کەسە.

زمان : پەشتۆن.

## ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی دۆڵی سوات

سوات بەشێکە لە پاکستان و مێژوویان هاوبەشە هەر ڕووداوێك بەسەر پاکستان دا هات بێت ئەوا سوات لێ ی بێ بەش نەبووە.

دۆڵی سوات هەریەکە لە فارسەکان و ئەسکەندەری مەکدۆنی و هەندێك لە هۆزەکانی ئاسیای ناوەند بۆ ماوەیك حوکمڕانییان کردووە.

## گەشتنی ئاینی ئیسلام بە دۆڵی سوات

کاتێك موسڵمانەکان لەدەریای عەرەب پەڕینەوە و هەرێمی سەند یان فەتح کرد لەساڵی ٧١١ زایینی – ٩٣ کۆچی ئاینی ئیسلامیان بڵاوکردەوە لەم ناوچەیەدا.لە ساڵیَ ١٠٠٠ زایینی –٣٩١ کۆچی تورکە موسڵمانەکان لە ئێرانەوە هاتن و باکوری پاکستان یان فەتح کرد.

لەسەردەمی مەلیك مەحمودی غەزنەوی دا ناوچەی زیاتر فەتح كرا لە هەندێك قۆناغدا هەموو هەرێمی سەند بەدەست موسڵمانەكانەوە بوو.
شاری لاهور كرا بە پایتەخت و بوو بە پێگەیەكی بەهێزی رۆشنبیری ئیسلامی.
لەساڵی ٦٠٣ كۆچیی – ١٢٠٦ زایینی ئیمپراتۆریەتێكی بەهێزی ئیسلامی دامەزرا كە زۆربەی ناوچەكانی باكوری هیندستان لەژێر فەرمانڕوایەتی ئەم ئیمپراتۆریەتەدا بوو هەتا ساڵی ٩٣٣ كۆچی – ١٥٢٦ زایینی لەم مێژووە بەدواوە بابار دەركەوت كە حاكمێكی موسڵمان بوو لە مەغۆلەكان بوو هەستا بە فەتح كردنی پاكستان و باكورو ناوەندی هیندو بەنگلادیشی هەمووی یەكخست و شێوە زمانێكی هاوبەشی بۆ سەرجەم ناوچەكە دانا كە ئەم زمانە نوێ یە لەژێر كاریگەری زمانی هیندی و فارسی دا بوو ئەو زمانە تازەیە بە (دوریی یە ) بەناوبانگە.

سەردەمی داگیركاری بەریتانی

لە ساڵی ١٧٤٠ زایینی ئیمپراتۆریەتی مەغۆل بەرەو لاوازی و لێك هەڵوەشانەوە چوو،كۆمپانیای هیندی رۆژهەڵات لە رێگەی باڵی سەربازیەوە زنجیرەیەك شەڕی بەرپا كرد لە بنجاب و سەند لە چلەكانی سەدەی نۆزدەهەمەوە توانی ئەو ناوچانە بخاتە ژێر ركێفی دەسەڵاتەكەیەوە و ناوچەكانی خۆی فراوان بكات.
لەساڵی ١٨٥٨ حكومەتی بەریتانی دەستی گرت بەسەر هەموو ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی كۆمپانیای هیندی رۆژهەڵات دا بوو لەو بەرواره بەدوواوە هەموو ئەو ناوچانە بە زەوی یە هیندی یە بەریتانی یەكان ناسرا.

بەریتانی یەکان لە هەر ناوچەیەك بە جۆرێك دەسەڵاتیان هەبوو هەندێك ناوچە ڕاستەوخۆ خۆیان ئەیانبرد بەڕێوە و لە هەندێك ناوچەش بە ناڕاستەوخۆیی و هەندێك ناوچەی کەم بەدەسەت موسڵمانەکانەوە بوو.

ناوچەی دۆڵی سوات لەو سەردەمی دەسەلاتی بەریتانی یەکان دا لەژێر تاجی مەلیکی بەریتانیادا بوو

بەریتانیا هەستا بەدروست کردنی قوتابخانەو پەیمانگا بەمەبەستی فێرکردنی لاوانی ئەو ناوچەیە بە کلتورو ڕۆشنبیری خۆرئاواو هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بوو نەوەیەك بە فیکری رۆژئاوا پێبگەیەنێت.هیندۆسەکانیشی هێنابووە ناوچەکەو زۆربەی بەڕێوبەرایەتی و یەکە ئیداریەکان بە دەست هیندۆسەکانەوە بوو،بەڵام موسڵمانانی ئەم ناوچەیە ئەو زوڵمەیان لا قبوڵ نەبوو دەستیان کرد بە جیهاد دژ بەو داگیرکاری یە کە ئەیانویست خاك و ئیمانی موسڵمانان داگیر بکەن ئاین و ڕەوشت لە بیر خەڵکی ئەو ناوچە ببەنەوە.

بە خۆڕاگری و جیهادی موسڵمانان توانیان بەریتانیانییەکان ناچار بکەن کە دۆڵی سوات ببێت بە ئەمارەتێکی سەربەخۆ.

دۆڵی سوات لەسەردەمی جەنگی داگیرکاری ئەمەریکا

بەهۆی نزیکی و هاوسنوری و هاو زمانی و هاونەتەوەیی و هاو ئاینی یەوە گەلی پاکستان و ئەفغانستان زۆر نزیکن لەیەکەوە بە جۆرێك خێڵە هاو سنورەکان لە ناخۆشی یەکانی یەکتردا هاوبەشی یەکتر ئەکەن.

هەرچەندە لە ساڵی ١٩٩٥ کاتێك صوٚفی محمد خان سەرکردەی بزووتنەوەی (تطبیق الشریعة المحمدیة) بڕیاری جێبەجێ کردنی دەستوری ئاینی ئیسلام دا لە دۆڵی سوات لەلایەن حکومەتە بەکرێ گیراوەکەی پاکستانەوە کەوتە بەر هەڵمەتێکی چەکداری گەورە.

کاتێـك ئەمــەریکا لــە دوای ١١ ســێبتەمبەر بڕیــاری جــەنگی دا دژ بــە تاڵیبان،موسـڵمانانی دۆڵـی سـوات بەسـەرکردایەتی مەولـەوی صـۆفی محمد زیاتر لە ١٠ هەزار چەکداری خۆبەخشی نارد بۆ هاوکاری تاڵیبان تا بجەنگن دژ بە ئەمەریکا،بەڵام زۆربەیان لە ڕێگادا بەر لەوەی بگەنە کابوڵ بەهۆی هێرشی فڕۆکە جەنگی یەکانی ئەمـەریکاوە شـەهید بـوون و هەندێکیان بەدیلی کەوتنە دەست هێزەکانی ئەمەریکا.

لەسـاڵی ٢٠٠٢ نـاکۆکی نێـوان حکومـەت و مـەولانا فـەزلولاّ و صـەهر صۆفی موحەمەد بە هۆی خواستی سەرکردەکانی دۆڵـی سوات بۆ جێ بــەجێ کردنــی شــەریعەتی ئیــسلام وڕێگــری لەلایــەن حکومــەتی پاکستانەوە ئەم گـرژی و ئـاڵۆزی یـە درێـژەی کێشا تـا سـاڵی ٢٠٠٧ حکومـەتی پاکستان بە زەبری سـوپا هێرشـی کاولکارانـەی کـردە سـەر دۆڵــی ســوات.لــە ســاڵی ٢٠٠٧ ســوپای پاکــستان هێرشــی کــردە سـەرمزگەوتی لال لـە ئیـسلام ئاباد بەتۆمـەتی ئـەوەی کـە ئـەم مزگـەوتـە کەسی توندڕەو پەروەردە ئەکات.

لـە مـانگی یۆلیـۆی٢٠٠٧ لەسـەروبەندی هێرشـی سـەر ئـەو مزگـەوتـە پەریۆز موشەرەف بڕیـاری دا جارێکی تـر سـوپا بڵاو بکاتـەوە لـە دۆڵـی سوات تا دەست بکاتەوە بە کوشتن و بڕینـی موسـڵمانان بۆیـە جارێکی ترشەڕ لەم ناوچەیە دەستی پێ کردەوە و درێژەی کێشا تا نۆفەمبـەری ٢٠٠٧ هێرشی فڕۆکە جەنگی یەکان زۆربـەی گوندەکانی دۆڵی سواتی خاپوور کرد و بەهەزارەها کەس ناچار بوون ئەو ناوچە چۆڵ بکەن.

لەمایۆی ٢٠٠٨ چەکدارەکانی تاڵیبان کە فەزلولاّ سەرپەرشـتی ئـەکردن ڕێکەوتننامەیەکیان لە گەڵ حکومەتی ئیسلام ئاباد مۆر کرد کەپێکهات

بوو له ١٩ خاڵ،بەڵام حکومەت هیچ کام لەو خاڵانەی نەخستە بواری جێ بەجێ کردنەوە.
لەمانگی یۆنیۆی ٢٠٠٨ حکومەتی ئیسلام ئاباد لەو ڕێکەوتننامەیە پەشیمان بوویەوەو جەنگ لەنێوان هەردوولا هەڵگیرسایەوە و بەهاوکاری ئەمەریکا بەسەدان زرێپۆش و چەکی قورس و فڕۆکەی جەنگی ڕەوانەی دۆڵی سوات کردوو دەستی کرد بە بۆردومانی کوێرانەی ئەم ناوچەیەو بەو هۆیەوە خەڵکی ئەم ناوچە توشی ئاوارە بوون نزیکەی لە ٦٠٪ خەڵکی ئاوارە بوون وبەهەزارەها خانووی هاولاتیانی ئەم ناوچەی لەگەڵ زەوی داتەخت کران و ١٥٠ قوتابخانە بەهۆی بۆردومانی فڕۆکەکانی سوپای پاکستانەوە خاپورکرا.
شەڕ بەر دەوام بووتا ساڵی ٢٠٠٩ و نزیکەی پانزە هەزار سەرباز ئەجەنگان دژ بە چوار هەزار موجاهید بە شێوەیەکی دڕندانە شەڕیان ئەکردو دەستیان لەکەس نەئەپاراست و جیاوازیان نەئەکرد لە نێوان هاولاتی و موجاهیدان دا.
موسڵمانانی دۆڵی سوات تەنها تاوانێك کە هەیانبوو ئەیانەوێت کار بە یاسای ئیسلام بکرێت و بەس.
لە ١٤-٤-٢٠٠٩ سەرۆك وەزیرانی پاکستان ڕەزامەندی نواند لەسەر جێ بەجێ کردنی یاسای ئیسلام لە دۆڵی سوات،بەڵام ئەم ڕێکەوتنە وەکو ئەوانی تر تەنها لەسەر کاغەز بوو خاڵەکانی نەچووە بواری جێ بەجێ کردنەوە.
موسڵمانان لە دۆڵی سوات سەرلەنوێ کەوتنەوە بەر شاڵاوی دڕندانەی حکومەتە ئەڵقە لە گوێکەی ئەمەریکا و دۆڵی سوات داگیر کرایەوەو زۆربەی خەڵکەکەی ئاوارە بوون و ماڵ و حاڵ یان وێران کرا.

بەکورتی، ئازاری موسڵمانان لە دۆڵی سوات ی پاکستان جیاوازی هەیە لەگەڵ وڵاتانی تر کە ئازاری موسڵمانان ئەدەن و مافەکانیان پێشێل ئەکەن،چونکە گەلی پاکستان زۆربەیان موسڵمانن،بەڵام گرفتی موسڵمانان لە پاکستان ئەوەیە دەسەڵاتدارانی پاکستان بوونەتە ئاڵقە لە گوێ ی ئەمەریکاو هەرچی فەرمانێك لە کۆشکی سپی یەوە دەربچێت لە ئیسلام ئاباد زوو جێ بەجێ ئەکرێت.

تـەنها داوایـەك کـە موسـڵمانانی دۆڵـی سـوات هـەیانبێت ئەوەیـە کـە ئەیانەوێـت ئـاینی پـیرۆزی ئیـسلام بکەنـە بەرنامـەی ژیانیان،ئـەوەش سروشترین مافە کەچی حکومەتە ئاڵقە لـە گوێکەیان ئەو مافەیان پـێ ڕەوانابینێـت و بـەناوی تـیرۆرەوە کەوتۆتـە قـەتڵ و عـامی ئـەم گەلـە ستەمدیدەیە.

# ئازاری موسڵمانان لە بۆرما (میانمار)

بۆرما ئەکەوێتە باشوری ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئاسیاو دەورە دراوە بەم وڵاتانە لە باکورەوە چین و هیندو لە باشوورەوە تایلاندو لەڕۆژهەڵاتی یەوە چین ولاووس و تایلاند لە ڕۆژئاواوە هیند و بەنگلادیش

ڕووبەری خاکەکەی : ٦٧٨٥٠٠کم

پایتەخت:ڕانگۆن

ژمارەی دانیشتوان : ٥٠ ملیۆن کەسە

ژمارەی موسڵمان ١٠: ملیۆن کەسە

موسڵمانان بەزۆری لە ناوچەی ئاراکان نیشتەجێن و لەوێ زۆرینە پێکئەهێنن بەڕێژەی لە ٧٠٪ ی دانیشتوان،بەڵام موسڵمانان لەم ناوچەیە توشی دەرکردن بوونەتەوە بەجۆرێك زیاتر لە یەك ملیۆن لەناوچەی شەتات لەنزیك بەنگلادیش بەئاوارەیی ژیان بەسەر ئەبەن،ملیۆن و نیوێکیان لە سعودییە ئەژین و نزیکەی نیو ملیۆنیان لە پاکستان ئەژین و نزیکەی ٣٥٠ هەزار کەس لە وڵاتەکانی ئیماراتی عەرەبی و مالیزیا و تایلاند بەئاوارەیی ژیان بەسەرئەبەن.

## گەشتنی ئاینی ئیسلام بە بۆرما

لە سەدەی حەوتەمی زایینی کاتێك بازرگانە موسڵمانەکان تێکەڵی یان دروست کرد بە هۆی بازرگانی یەوە لە گەڵ خەڵکی بۆرما ئیتر ئاینی پیرۆزی ئیسلام بڵاو بوویەوە لە بۆرما

موسڵمانەکان توانیان یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی دروست بکەن لە سەر دەستی سەلمان شاه لە ساڵی ١٤٣٠ زاینی موسڵمانەکان حوکمی ئەو ناوچەیان کرد هەتا ساڵی١٧٨٤ زاینی،ئەو ماوەیە ٤٨ پادشای موسڵمان حوکمی ناوچەی ئاراکانیان کرد،لە ساڵی ١٧٨٤ زاینی بوزی یەکان شەڕ یان کرد لە گەڵ موسڵمانەکانداو دواتر دەوڵەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٨٢٤ زاییني بۆرما یان داگیر کرد.

داگیرکاری بەریتانیا درێژەی کێشا تا ساڵێ ١٩٤٨ زاینی و سەربەخۆیی گەڕایەوە بۆ بۆرما،بەلاَم بەریتانیا و بۆرما رازی نەبوون ناوچەي ئاراکان سەربەخۆ بێت.

لە سایەی حکومەتی عەسکەرتاریەت:

موسڵمانانی ئاراکان بە جۆرەها شێوە توشی ئازارو ناڕەحەتی و دەرکردن و سوتانی ماڵ و موڵك وکوشت وبڕین ئەبنەوە کە وێنەی لە مێژوودا کەمە جگە لە سیاسەتی برسێتی و هەژار کردن وبەزۆر دەرکردنیان لەولاَتی خۆیان،ئەو سیاسەتانەی دژی موسڵمانان پەیڕەو ئەکرێت:

١- ڕێگری لە زەواج:کاتێك کچ و کوڕێك ئەگەنە کاتی زەواج دەزگا حکومییەکانی بۆرما ئیجباری موسڵمانە کان ئەکەن کە ئەو کچ و کوڕە بۆماوەی سێ ڕۆژ یاخود هەفتەیەك بمێنەوەلەدەزگایەکی تایبەتی حکومەتدا لەو ماوەدا سەیری گیان یان ئەکەن بەڕووتی پاشان دەرز یەکی کیمیای یان لێ ئەدەن کە ناهێڵێت مناڵ یان بێت و توشی نەزۆ کییان ئەکات،جگە لەوەی نزیکەی ١٠ ساڵ زیاترە ڕێگری زەواجی نێوان موسڵمانان ئەکرێت ئەوانەی بە نهێنی

زەواج ئەكەن ئەگەر پێ یان بزانرێت ئەوەی ڕەگەزنامەی ئەو وڵاتەیان لێ ئەسەندرێتەوەو لە بۆرما دەر ئەكرێن.

٢- ئاوارەكردن : بەزۆر دەركردنی موسڵمانانی ئاراكان لەسەر خاكی خۆیان ئێستا زۆربەیان لە وڵاتانی دراوسێ ئەژین و لە ژیانێكی كولله مەرگی دا ئەژین لە نێوان بەنگلادیش وبۆرما بە ئاوارەی و لەژێر باری برسێتی و نەبوونیدا ژیان بەسەر ئەبەن.

٣- زۆرێك لە موسڵمانان ئێستا لە بەندیخانەكان ژیان بەسەر ئەبەن بە جۆرەها شێوە ئەشكەنجەو ئازار ئەدرێن.

٤- تالاّ كردن:حكومەتی عەسكەر تاریەتی بۆرما زۆرجار ئەدات بەسەر گوندەكانی موسڵماناناو ماڵ و موڵكییان ئەگرێت و بەزۆر زەوتی ئەكات.

٥- ڕێگری خوێندن: سیاسەتی بڵاو كردنەوەی نەخوێنەواری و تێكدانی خوێندنگە ئیسلامییەكانلەلایەن حكومەتی بۆرماوە و بەزۆر خوێندنی ئاینی بوزی بە قوتابییە موسڵمانەكان و ڕێگری كردن لەتەواوكردنی خوێندنی زانكۆ بۆ قوتابییە موسڵمانەكان. هەر قوتابییەكی موسڵمان بچێت بۆ دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن و بگەڕێتەوە، ئەوا دەستگیردەكرێت و ئەیخەنە كونجی زیندانەوە،ئەم كردەوانە ناشیرنترین ڕووی پڕ لە ڕق و قینی حكومەتە بوزی یەكەی بۆرمایە دژ بە موسڵمانان پیادەی ئەكات تانەخویندەواری بڵاوبێتەوە بەناو موسڵمانانی ئاراكان.

٦- سیاسەتی هەژاركردن: حكومەتی بۆرما دەست ئەگرێت بەسەر موڵك و ماڵی موسڵمانانی ئاراكان و لەسەر زەوی وماڵ و حاڵی خۆیان دەریان ئەكات تا بێ دەست و بێ دەسەڵاتیان بكات و

نەتوانن ژیانێکی ئاسایی بژین وا لە موسڵمانەکان ئەکات وەکو کۆیلە خزمەتی خەڵکی بکەن وحکومەت ئەیەوێت لە ڕێگەی هەژار کردنیانەوە بیانچەوسێنێتەوە.

ئاوڕدانەوەیەك لە ڕیزبەندی ڕاگواستنی موسڵمانان

١- لە مانگی نیسان ی ساڵی ١٩٦٧ حکومەتی بۆرما نزیکەی ٢٠٠٠ کەسی لە موسڵمانەکان را گواست بۆ جێگە یەکی نادیار کە تائێستا کەس هەواڵێکی نی یە لەبارەیانەوە جگە لەوە نەیانهێشت هیچ شتێك لە گەڵ خۆیان بەرن.

٢- لە مانگی مارسی هەمان ساڵ دا حکومەتی بوزی بۆرما هەندێ لە موسڵمانی ئاراکانی دەرکرد لەسەر حاڵ و ماڵی خۆیان و ئاوارەی سنوری بەنگلادیشی کردن وحکومەتی بۆرماپروپاگەندەی ئەوەی بلأوکردەوە گوایا ئەمانە پاکستانین.

٣- لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵ حکومەتی بۆرما نزیکە ١٣ هەزار موسڵمانی دەرکرد لە سەر ماڵ و حاڵیان و نەیهێشت هیچ شتێك بەرن لە گەڵ خۆیان وزۆربەیان لە تونێتی و برسێتی دا مردن و کەمێکیان گەیشتنە پاکستان.

٤- لە ساڵی ١٩٧٥ حکومەتی بۆرما هەستا بە ڕەشە کوژی موسڵمان و ئەتکردنی ئافرەتەکانیان و دەستی گرت بەسەر ماڵ و موڵکیان دا و زۆربەی لاوانی موسڵمانی خستە بەندینخانەوە و زۆرێکی تری لێ ئاوارە کردن.

٥- حکومەتی بوزی بۆرما لە ساڵی ١٩٦٢دا ڕێگری چونی حەجی کردوە لە موسڵمانانی ئاراکان.

٦- پیس کردنی مزگه‌وت و شوێنه‌ ئاینییه‌کان و سوتاندن و ڕوخانی مزگه‌وت و تاڵاکردنی ماڵ و موڵکی موسڵمانه‌کان بۆته‌ شتێکی ئاسایی و ڕۆژانه‌ لێره‌و له‌وێ له‌ ناوچه‌ی ئاراکان ده‌بینرێ.

٧- کوشتنی زانایان:حکومه‌تی بۆرما زۆرێك له‌ زانایانی ئاینی و سه‌رکرده‌ ئیسلامییه‌کانکوشت و زۆرێکی لێ خستونه‌ته‌ به‌ندینخانه‌وه‌.

٨-له‌ ڕۆژانی ٨-٦-٢٠١٢ ڕۆژانی دواتر حکومه‌ت هه‌ستابه‌کوشتن و قه‌تڵ و عام کردنی موسلمانان و له‌ماوه‌یه‌کی که‌م دا زیاتر له‌ ٢٠ هه‌زار موسلمانی شه‌هید کردو ٣٠٠ هه‌زار موسڵمانیش له‌ترسی قه‌تل و عامه‌که‌ هه‌لهاتن بۆ وولاتی به‌نگلادیش و٥٠٠ که‌سیش بریندار کران و زیارت له‌٢٠ گوندی موسڵمانان سوتینران و ١٦٠٠ خانوو له‌ گه‌ڵ زه‌وی ته‌خت کرا و سه‌رۆکی بۆرما زۆر به‌ ڕاشکاوی له‌سه‌ر شاشه‌ی ته‌له‌فزیۆن ووتی هه‌موو موسلمانانی ئه‌م ولاته‌ له‌نێوده‌به‌م،ئه‌مانه‌ هاولاتی ئێمه‌ نین،بۆیه‌ هه‌ر ولاتیك ئه‌یانگرێته‌ خۆی من ده‌ریان ئه‌که‌م.

یاسای پێدانی ڕه‌گه‌زنامه‌:

حکومه‌تی بوزی بۆرما ساڵی١٩٤٨یاسایه‌کی ده‌رکرد دانی نا به‌ڕه‌گه‌زنامه‌ی موسڵمانه‌کان،به‌ڵام دوای چه‌ند ساڵێك حکومه‌تی بوزی که‌وته‌ بیانو گرتن وپڕوپاگه‌نده‌ی ئه‌وه‌ی بلاو کرده‌وه‌ که‌ گوایه‌ ده‌ستاکاری یاسا که‌ ئه‌کات له‌ ٤ - یۆلیۆی - ١٩٨١ ڕه‌شنوسی یاسایه‌کی تازه‌یان ده‌رکرد که‌ زۆر توند بوو به‌رامبه‌ر به‌ موسڵمانه‌کان له‌ ساڵی ١٩٨٢ یاساکه‌ ده‌ر چوو که‌ هاولاتی بۆرمایی به‌م جۆره‌ پۆلێنی کردبوو:

١- هاولاّتی پله یەك ئەمانە بوو ( كارینو ییەكان . شائیونییەكان . بەهاییەكان . چینییەكان . كامینییەكان ).
٢- هاولاّتی پله دوو تێكەڵەی ئەو ڕەگەزانەی سەرەوە.
٣- هاولاّتی پله سێ:ئەم پلەیە شمولی موسڵمانەكان ئەكات حكومەت وا پێناسەی موسڵمانەكان ئەكات كە هاولاّتی ڕەسەنی بۆرما نین،بەڵكو وەختی خۆی لە كاتی داگیر كاری بەریتانیا هاتوون،ئەوەش بە گوێرەی قسەی سەركردەكانی حكومەت.ئێستا موسڵمانان لە بۆرما بێ ناسنامەن و لە هەموو مافێك بێ بەشن حكومەت هەركاتێك بییەوێت دەریان ئەكات

حكومەت دواتر چوار جۆر ڕەگەزنامەی پێشنیار كرد

١- شوانكارە
٢- هاولاّتی
٣- ناسنامە پێدارو
٤- بێ ناسنامە

كۆمەڵی یەكەم و دوهەم هەموو مافێكی سیاسی و ئابوری هەیەو بۆی هەیە بەشداری بكات لە ئیدارەی دەوڵەوت

كۆمەڵەی سێ یەم ڕەگەزنامە پێدراوە بە كۆمەڵێك مەرجی تەعجیزی.

كۆمەڵەی چوارەم بێ ناسنامەكان لە شوێنێك دابێ دەستگیردەكرێن و دواتر بۆ ماوەیەك ئەخرێنە سەر ئیشێك،ئەگەر ئیشی باشی پێ كرا ئەوا كارتی ڕێگە پێدان وەر ئەگرێت و بە هاولاّتی بێگانە ئەژمار ئەكرێت.

موسڵمانەکان لەسەر خاکی خۆیان وەکو هەتیو سەیر ئەکرێن لە سەر ماڵ و حاڵیان دەرئەکرێن و ئەچەوسێنرێنەوە هەرکاتێك بیانەوێت ئەیانەکوژن و ئاوارەی وڵاتان ئەکرێن وبرسی و تینوو بێ ماڵ و حاڵیان ئەکەن و لە باتی نیشتیمانی خۆیان ئەبێت لە چادرگە ژیان بەسەر بەرن.

**ئەو گرفتە گشتی یانەی کە موسڵمانەکان هەیانە**

موسڵمانەکان جگە لە کوشتن و بڕین و ئاوارەکردن ئەم گرفتانەی لای خوارەویان هەیە:

١- خۆماڵی کردنی مزگەوت.

٢- خۆماڵی کردنی ڕۆژنامەو گۆڤارە ڕۆژانەو هەفتانییەکان.

٣- ڕێگری لە بڵاو کردنەوەی کتێبی ئیسلامی.

٤- ڕێگری لە دروست کردنی مزگەوت.

٥- ڕێگری لە بانگ دان جگە لە مانگی ڕەمەزان.

٦- ڕێگری لە چونەدەرەوەی موسڵمانان بۆ دەرەوەی وڵات.

٧- قەدەغەکردنی دامەزراندنی موسڵمانەکان لە دەوامی حکومەت .

٨ - دیاریکردنی چەند مزگەوتێك بۆ بۆنەو ئاهەنگەکان .

# ئازاری موسڵمانان لە تورکیا

## تورکیا

یەکێکە لەو وڵاتانەی ئەکەوێتە کیشوەری ئاسیاوە پێگەو شوێنی جوگرافیای تورکیا زۆر گرنکە چونکە هەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەوروپا بەیەکەوە ئەبەستێتەوە.

تورکیا دەورە دراوە بەم وڵاتانە:

لە ڕۆژهەڵاتەوە جۆرجیا . ئەرمینیا . ئازەربایجان . ئێران

لە باکورەوە . دەریایی ناوەڕاست . عێراق . سوریا

لە باشورەوە . لەڕێگەی ئاوەوە میصر . دەریای ئیجە . یۆنان .

لەڕۆژئاواوە . بولگاریا

لە باکورەوە . دەریایی ڕەش

ڕووبەری خاکەکەی ٧٨٠٥٦٢کیلۆمەترە لە٧٩ ٪ ئەکەوێتە کیشوەری ئاسیاوە

لە ٢١٪ ئەکەوێتە کیشوەری ئەوروپاوە

ژمارەی دانیشتوان (٧٢ ملیوێن کەسە

زمان . تورکی زمانی فەرمی دەوڵەتە لە٧٧٪بە تورکی قسە ئەکەن.

کورد .بەشێك لە خاکی کوردستان دراوە بە تورکیا لە لایەن ئینگلیزەوە کوردەکان نزیکە لە٢٢ ٪ی دانیشتوان پێکدێنن و بەزمانی کوردی قسە ئەکەن(لەدوای ڕوخاندنی خیلافەتی عوسمانی تەنها بە زمانی تورکی قسەیان ئەکرد چونکە زمانی کوردی قەدەغەبوو،بەڵام بەهاتنە

پێـــشەوەی لایەنــە ئیــسلامییەکانی تورکیــا ئێــستا زمــانی کــوردی قەدەغەنییە)

دراو . لیرەی تورکی

تورکیا یەکێکە لەو ولاّتانەی کە زۆر بە سەختی بەرگری لە عەلمانی یەت ئەکات بە جۆرێك جیاوازی نێوان ئەوروپاو تورکیا لەوەدایە کە ئەوروپا تەنها دینی لە دەوڵەت جیا کردۆتەوە،بەلاّم تورکیا زۆر بەڕاشکاوانە دژی هەموو مەبادیئە ئیسلامی یەکانە

هەرچەندە تورکیا چوارسەدە سەرکردایەتی هەموو جیهانی ئیسلامی ئەکرد بەلاّم بەهۆی هاتنی کەمالی یەکان بۆ سەرحوکم و ڕوخانی خیلافەتی ئیسلامی ئیتر ئەو ولاّتە ئیسلام دۆست وئیسلام خوازە کەوتە ژێر دەسەلاّتی کۆمەڵێك غەرب زادەی ماسۆنی دژایەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام یان کردو دینی ئیسلام یان لەسەر شانۆی دەسەلاّت لابردو هەوڵیان دا بەفوی دەمیان خۆری ئیسلام بکوژێننەوە.

لەدوای ڕوخان و یەکەم هەوڵی موسڵمانان

لە ساڵی ١٩٢٤ کە قەلاّی خیلافەت ڕووخا یەکەم کەسێك هەوڵی دا عیزەت و شکۆمەندی خیلافەت بگێڕێتەوە سەرکردەی کوردی موسڵمان شێخ سەعیدی پیران بوو خوای گەورە لێ ڕازی بێت

بەلاّم لەلایەن کەمالی یەکانەوە زۆر بە توندی ڕووبەڕووی شێخ سەعید بوونەوە و شۆڕشە کەیان لە ناو بردوو شێخ سەعیدو تەواوی سەرکردەو شۆڕش گێڕان یان لە سێدارە دا

هەڵبەت لە تورکیا لە دوای خیلافەت ئەمە یەکەم چەخماخەی شۆڕش بوو،بەڵام کەمالی یەکان لە یەکەم ڕۆژی هاتنە سەر حوکم یان سوپا یان کردە پارێزەری دەوڵەتە عەلمانی یەکان هەر شۆڕشێ یاخود دەنگ و تەیارێك دەرکەوت بێت مەترسی بۆ دەوڵەتە عەلمانی یەکان دروست کردبێت ئەوا سوپادڕندانەکەی تورکیا زوو هاتۆتە سەر خەت و زۆر بە زوویی هەوڵی لەناو بردنی تەیارانی عەلمانی یەتی داوە.

هەوڵی دووهەم

بۆ دووەم جار موسڵمانانی تورکیا خۆیان ڕیکخست بۆ گێرانەوەی شکۆمەندی بۆئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەو شەرەفەش بەرکورد کەوت و بۆ جاری دووهەم لە لایەن خواناسی گەورە بدیع زەمان سەعیدی نەورەسی عارف وزاناو خواناسی گەورە ی کوردکە لەساڵی ١٩٢٥هەوڵی دا کە ئاینی ئیسلام جارێك تر بێتەوە سەر شانۆی دەسەڵات،بەڵام لەلایەن سوپا دڵ ڕەقەکەی کەمالی یەکانەوە هەوڵی ئەویش لە بار براو مامۆستا یان بۆ ناوچەی بۆردۆ نەفی کرد دواتر لەوێشەوە گواستیانەوە بۆ ناوچەی ئۆرڤەهەتا ساڵی ١٩٦٠ مایەوە

دوای وەفاتی لاشەی پیرۆز یان دەرهێنا و سەرە نگومیان کرد لاشەکەی هەتا ئێستا کەس نازانێت لە کوێ یە؟؟؟؟

دوای شەش ساڵ لە ڕوخانی خیلافەتی ئیسلامی واتا لە ساڵی ١٩٣٠ سەرجەم قوتابخانەو خوێندنگە ئیسلامییەکانداخران کە ساڵانە بە هەزارەها خوێندکارو پێشنوێژو مامۆستای ئاینی لەو قوتابخانانە دەرئەچوون.دوای ٨ ساڵ لە مەرگی کەمال ئەتاتورك و لە ساڵی ١٩٣٨ توانرا هەندێ لە خوێندنگە ئیسلامییەکانبکرێنەوە بەتایبەت لە ناوچە

گوند نشینەکان کە تاو ئەوکاتەش هەر پاپەند بوون بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە.

کەمال ئەتاتورك و دژایەتی ئاینی ئیسلام:

لەدوای ڕووخانی خیلافەتی ئیسلامی کەمال ئەتاتورك ئەم بڕیارانەی دا:

١- پچڕاندنی هەموو پەیوەندیەکی ئیسلام بە توریکاوە.

٢- ڕەفز کردن و لەبناغە هەڵوەشاندنەوەی خیلافەتی ئیسلامی

٣- دەرکردنی خەلیفەو ئەوانەی لێی نزیك بوون لەناو خاکی تورکیاو دەستگترن بەسەر ماڵ و موڵکیاندا.

٤- دەرکردنی دەستورێکی مەدەنی لەبری دەستوری کۆنی تورکیا.

٥- بەیانی دەرکردنی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت. لە ساڵی ١٩٢٣ و لابردنی ئەو بڕگەیەی لەدەستور کە ئەڵێت ئیسلام دینی دەوڵەتە.

٦- لەساڵی ١٩٢٤ وەزارەتی ئەوقافی هەڵوەشاندەوەو لەبری ئەو وەزارەتی مەعاریفی دانا.

٧- لەساڵی ١٩٢٦ لەبری دەستوری ئیسلامی دەستوری سویسرای دانا بۆ تورکیا ڕۆژمێری کۆچی گۆڕی لەساڵی ١٣٤٢ گۆڕی بۆ ساڵی ١٩٢٦ لەسەرانسەری تورکیا.

٨- ساڵی ١٩٣٣ هەموو خوێندنگە ئایینی یەکانی هەڵوەشاندەوەی تەکیەو خانەقاکانیشی داخست.

٩- جلی زانایانی ئاینی گۆڕی و ناچاری کردن کە دوای دەوام جلی تر لەبەر بکەن.

١٠-سەرپۆشی قەدەغە کردو شەبقەی بەناچاری کردە سەرپیاوان.

١١- پۆشاکی حیجابی قەدەغە کردو ئافرەتانی ناچار کرد بەلەبەرکردنی جلی سفورو داوای ئازادی ئافرەتانی ئەکردو دەستی کرد بە کردنەوەی یانەی خواردنەوە و سەما کردن.

١٢- پرۆگرامی خوێندنی گۆڕی و زمانی تورکی و مێژووی کۆنی تورکیای هێنایەوە بۆ خوێندن و وشەی عەرەبی قەدەغە کرد.

١٣- بەهەموو شێوەیەك ڕووی تورکیای ئەکردە ئەوروپا و ئەیویست تورکیا دابڕێت لەجیهانی ئیسلامی

١٤- زۆرێك لە مزگەوتەکانی کرد بە کۆگایی دەرمان و مۆزەخانە و بانگی قەدەغە کرد لە دوای مەرگی کەمال ئەتاتورك و قۆناغی کاری ئیسلامی.

لەساڵی ١٩٤٧ حاڵەتی ئیسلامی لە تورکیاقۆناغێکی تری بڕی و دووڕێکخراو لەلایەن ئیسلام خوازانی تورکیاوە دروست کران کە بانگەشەی هەندێ لایەنی سەرەتایی ئیسلام یان ئەکرد ئەو دوو ڕێکخراوەش بەناوی ڕێکخراوی ئیسلام و ڕێکخراوی پاکی بوو.

لەساڵی ١٩٥٠ قۆناغی کاری ئیسلامی لە تورکیا هەنگاوی زیاتری نا بەتایبەت لە سەردەمی عەدنان مەندەریس کە تا ساڵی ١٩٦٠ لە سەر حوکم مایەوە عەدنان مەندەریس کەسێکی نیشتیمانی بوو توانا ی پێکەوە ژیانی هەبوولە گەڵ هەموو پارت و لایەنە کانی سەرگۆڕەپانی تورکیا بۆیە ئیسلام خوازانی تورکیا سودیان لەو دەرفەتە وەرگرت وهەنگاوی باشیاناو توانیان پەیمانگاو خوێندنگەی ئیسلامی زیاتر بکەنەوەو مامۆستاو وتار خوێنی زیاتر پێ بگەێنن،بەڵام سوپای تورکیا چاوی بەگەشەسەندنی ئاینی ئیسلام هەڵنەدەهات و خۆی بەپارێزەری دەوڵەتە عەلمانی یەکەی تورکیا ئەزانی، بۆیە کودەتایەکی

خوێناوی کرد بەسەرحکومەت داو عەدنان مەندەریس یان دا لە سێدارە لەگەڵ جەلال بەیار کەسەرۆکی پارتی دیموکرات بوو سەرەك وەزیران سەر بەوان بوو لەگەڵ کۆمەڵێك لەسەرکردەی حیزب دران لەسێدارە.
لە دوای ئەو کودەتا خوێناوی یە قۆناغی کاری ئیسلامی توشی شۆکێکی گەورە بوو، ئەم بارە ئاڵۆزە درێژەی کێشا لە ساڵی ١٩٧٢کەسایەتی سیاسی گەورە نەجمەدین ئەربەکان حیزبی سەلام ی دامەزراندو بانگەشەی سیستەمێکی دادپەروەرانەی ئەکرد بۆ تورکیا،نەیتوانی حیزبەکەی وەکو حیزبێکی ئیسلامی دەربخات تاوەکو هەر لە یەکەم ساتی دەرکەوتنی لەناو نەبرێت و دروشمی چاکسازی نیشتمانی بەرزکرد بوەوە.
دوای ئەوەی نەجمەدین ئەربەکان چاوی ئەکەوێت بە ڕەجەب تەیب ئەردۆغان کە ئەو کاتە خوێندکار بوو لە کولێژی ئابوری و سیاسەت لە مەرمەرە زۆر پێ ی سەرسام ئەبێت داوای لێ ئەکات ببێت و بە ئەندام لە حیزبی سەلام ڕەجەب تەیب ئەردغان داواکەی قبوڵ ئەکات و لەدوای دەس بەکار بوونی لەژێر چاودێری مامۆستا ئەربەکان هەنگاوی گەورە ئەنێت بۆ بەرەو پێش بردنی حیزبی سەلام، بەلأم هەنگاوە گەورەو خێراکانی حیزبی سەلام جێگەی نیگەرانی سوپای عەلمانی تورکیا ئەبێت،بۆیە لە ساڵی ١٩٨٠ حیزبی سەلام هەڵدەوشێنێتەوە لەلایەن حکومەتی تورکی عەلمانی یەوە.دوای ٣ ساڵ لە هەڵوەشاندنەوەی حیزبی سەلام حیزبێکی نوێ ئیسلامی دا ئەمەزرێت بەناوی حیزبی ڕەفاە لەم حیزبەدا زیاتر ئەستێرەی کارو چالاکی ئەردۆغان ئەدرەو شێتەوە تەمەنی تەنها ٣١ ساڵ ئەبێت ئەکرێت بە سەرۆکی بەشی ئەستانبوڵی حیزبی ڕەفاە.

حیزبی ڕەفاه زۆر بەخێرایی له ناو چین و توێژە جیا جیا کانی تورکیا بلاْوئەبێتەوە بە جورێك لە هەردوو شارە گرنگەکەی تورکیا ئەنکەرەو ئەستانبولْ ئەبێتە حیزبی پلە یەك لەڕووی دۆست و ئەندام لایەنگرەوە.لە سالْیْ ١٩٩٤ بەشداری هەلْبژاردن ئەکەن و دەنگێکی زۆر بەدەست ئەهێنن بەچەشنێك زۆرێك لە شارەوانی یەکان ئەبەنەوە وئەردۆغان ئەبێتە سەرۆکی شارەوانی ئەستەنبولْ.

ئەردۆغان توانی تەنها لە ماوە ٤ سالْ دا گۆرانکاری زۆر گەورە بکات بەتایبەت لە کەرتی کارەباوئاوچارەسەری گرفتەکانی ئەو دوورکەرتە گرنگە بکات جگە لەوەی لەڕووی پاك و خاوێنی یەوە توانی ئەستنەنبولْ پاك و خاوێن بکاتەوە وسەوزای یەکی زۆری تێدا بڕوێنیْ کە پێشتر زۆر فەرامۆش کرا بوو.

کاتێك ئەم هەنگاوە گەورانەی نا خەلْکی پرسیار یان لیْ کرد دەربارەی هۆکاری ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی ئەردۆغان لە وەلاْم دا بەوپەڕی شانازی یەوە ووتی( ئێمە چەکێك مان پیْ یە ئێوە نازانن کە ئەو چەکە چەکی ئیمانەو ئێمە پابەندین بەڕەوشت و ئاکارە ئیسلامییەکانو شوێنکەوتەی ڕێبازی پێغەمبەرین صل الله علیه وسلم).سالْی ١٩٩٥ حیزبی ڕەفاه بەشداری کرد لە هەلْبژاردنی پەرلەمان دا و توانی لە کۆی ٥٥٠ کورسی پەرلەمان ١٥٨ کورسی بباتەوە،بەلاْم حیزبە عەلمانی یەکان چوونە بەرەیەکەوە بە تەواوی دەنگ و ڕەنگە جیاوازە کان یانەوە لە دژی حیزبی ڕەفاە بە سەرۆکایەتی سلێمان دیمیرل، بەلاْم ئەم هاوپەیمانی یەتەیان زۆر درێژەی نەکێشاو هەرزوو لە بەریەك هەلْوەشایەوە

له ساڵی ١٩٩٦ نەجمەدین ئەربەکان بوو بە یەکەم سەرۆك وەزیرانی موسڵمان لە دوای ڕوخانی خیلافەتی ئیسلامی یەوە لە ساڵی ١٩٢٤ .

سوپای عەلمانی تورکیا بوون بە دوو بەشەوە بەشێ کیان پێ یان باش بوو بە زۆر ئەربەکان لابدەن لە سەرکورسی دەسەلات بەشەکەی تری ئەیانویست لێ بگەڕێن تا خۆی فەشەل ئەهێنێت چونکە لەو بڕوایەدا نەبوون ئەربەکان سەرکەوتن بەدەس بێنێت،بەلام ئەربەکان توانی لە ماوەی تەنها یەك ساڵ دا قەرزی کەڵەکە بووی سەر تورکیا کە ٣٨ ملیار دۆلار بوو بێنێتە خوارەوە بو ١٥ ملیار دۆلارو توانی هەنگاوی چاك بنێت بۆ بوژاندنەوە ئابوری داتەپیوی تورکیا.

توانی لە ماوەی ئەو ساڵەدا گەشەیەکی باش بدات بە کرانەوەی تورکیا بەڕووی جیهانی دەرەوەداو خەریك بوو نزیك بێتەوە لە چارەسەر کردنی کێشەی کورد لە تورکیا،بەلام سوپای عەلمانی تورکیا چاوی بە هەنگاوە چاکسازی یە کانی ئەربەکان هەڵنەدەهات و دوور لە هەموو ئەخلاقێك بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئەربەکان بە دەنگی میللەت هاتۆتە سەر کورسی دەسەلات کودەتا یان کرد بەسەر ئەربەکان داو زرێپۆشیان بلاو کردەوەبەسەرجادەو سەرشەقامەکانی ئەستەنبوڵ ئەربەکان یان ناچار کرد دەست لەکاربکێشێتەوەو لەسەر کورسی دەسەلات بێتە خوارێ و حیزبی ڕەفاه یان هەڵوەشاندەوە ئەربەکانیان تاوانبار کرد بە تومەتی جۆراو جۆر گرنگترین تۆمەت دەست درێژی کردن بوو بۆ سەر عەلمانییەت.جگە لەئەربەکان ئەردۆغان یش خرایە بەندینخانەوە بەهۆی خوێندنەوەی شیعرێکەوە هەردوو سەرکردە بۆ ماوەی ٥ ساڵ کاری سیاسیان لێ قەدەغە کرا.لە ساڵی ٢٠٠٠ لە ژێر چاودێری ئەربەکان قۆتان کە خوێندکاری خۆی بوو حیزبێکی نوێیان

بۆ یەکەم جار ئیبن بەتوتە گەڕیدەی عەرەب ئەچێتە سەرەندیب کە ئەو زەمەنە ئەوە ناوی بووە.سیریلانکا بۆ سێ جار لەلایەن پورتوگال و بەریتانیا و هۆڵەنداوە داگیر کراوە هەر کام لەو وڵاتە داگیر کەرانە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ خێرو بێری ئەم وڵاتەیان تالآن کردووە ودەستیان کردووە بە کوشتن و بڕینی موسڵمانان و هەوڵی بڵاوکردنەوە ئاینی مەسیحیان داوە.بۆ یەکەمجار پورتوگالییەکان لەساڵی ١٥٠٥ خاکی سیریلانکا یان داگیرکردوو بۆ ماوەی ١٥٠ ساڵ ئەم داگیرکاری یە درێژەی کێشا.

هۆڵەندییەکان لە ساڵی ١٦٨٥ پرتوگالییەکان یان وەدەرناو خۆیان دەستیان گرت بەسەر ئەم وڵاتەداو وەکو بنکەیەکی سەربازی و بازرگانی سودیان لێ وەرگرت جگە لەوەی دەستیان کرد بە لەنێوبردنی موسڵمانەکان و بەزۆر لەسەر خاك و ئاو وشارو گوندەکان دەریان ئەکردن جگە لەوەی چەند بنکەیەکیان بۆ هەڵمەتی نەصرانی کردنی خەڵکی کردەوە.

هۆڵەندییەکان تا ساڵی ١٧٩٦ حوکمی ئەم ولاتەیان بەدەستەوە بوو،لە ساڵی ١٧٩٦ بەریتانی یەکان دەست یان بەداگیر کردنی سیریلانکا کردو لە ساڵی ١٨١٥ بەتەواوەتی دەست یان بەسەر ئەم ولاتەدا گرت،بەریتانی یەکان برەویان بەچاندنی چا دا لەم وڵاتەدا.لە ساڵی ١٩١٥ خەڵکی سیریلانکا کەوتنە جمو جۆڵ بۆ ئازاد کردنی ولاتەکەیان کەسەدەیەك زیاتر بوو ولاتەکەیان داگیرکار بوو،لە ساڵی ١٩٤٨ سیریلانکا سەربەخۆیی خۆی وەرگرت.

## گەشتنی ئاینی ئیسلام بە سیریلانکا

کاتێك خەڵکی سیلان و دەووروبەری زانییان ئاینێکی تازە بڵاو بۆتەوە شاندێکیان نارد بۆ شاری مەدینە لەسەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتاب تا شارەزا بن لە ئاینی ئیسلام دوای ئەوەی شاندەکە چاویان کەوت بە ئەمیری موسڵمانان و ئاینیان قبوڵ کردو گەڕانەوە و دەستیان کرد بە بانگەواز بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام.جگە لەمان بازرگانە موسڵمانەکان بەهۆی کاروانی بازرگانی یەوە تێکەڵی خەڵکی ئەم ناوچەیە ئەبن و خەڵکانێکی زۆر موسڵمان ئەبن.

لەسەردەمی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی کۆمەڵێك لە هۆزی دیبال لە نزیك شاری کەراتشی ئیستا پەلاماری کەشتی یەك ئەدەن کەکۆمەڵێك موسڵمانی لەسەر بوو .

حەجاج بۆ یارمەتی موسڵمانەکان و دوو بارە نەبوونەوەی ئەو جۆرە پەلاماردانەوترساندنی دوژمنانی ئیسلام هێرشێکی سەربازی ئەکاتەسەر ئەو ناوچەیەبەسەر کردایەتی موحەمەدی کوڕی قاسم ولەم هێرشەدا ناوچەی سەرەندەب فەتح ئەکرێت.ئەم سێ هۆکارە ئەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەم وڵاتە،بەڵام بەهۆی ئەو داگیرکەرا نەی کە ئەم وڵاتەیان داگیر کرد دووژمنایەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام یان ئەکردو بەهەموو جۆرێك دژایەتی موسڵمانانیان ئەکرد و موسڵمانان یان ئاوارە ئەکردو بەسەدەها بنکەی تەنصیریان لەم وڵاتەدا کردووە ئەمانە هۆکار گەلێك بوون کە ژمارەی موسڵمانان لەم وڵاتەدا کەم بکات.

موسڵمانانی سیریلانکا لە نێوان چەکوشی تامیل و سندانی حکومەتدا

موسڵمانانی سیریلانکا تاڕادەیەکی باش خاوەن ئازادین لەدروست کردنی مزگەوت و قوتابخانەی ئاینی دا و خاوەن شەش وەزیرو چەند پەرلەمان تارێکن،بەڵام گرفتی موسڵمانەکان لە گەڵ پڵنگەکانی تامیلە کە یاخین لە حکومەت وزۆربەی موسڵمانەکان لەناوچەی ژێر دەسەڵاتی یاخی یە تامیلی یەکانن ولەلایەن یاخی یەکانەوە موسڵمانەکان تۆمەتبار ئەکرێن بەخیانەتکارو هاوکاریکردنی حکومەت و بەپێچەوانەوە حکومەتیش موسڵمانەکان تۆمەتبار ئەکات بەهاوکاری یاخی یەکانی تامیل و هەردوولا بەم بیانووە وە خەریکی قڕ کردنی موسڵمانەکان و ناچاریان ئەکەن بەزۆر لەوڵاتی خۆیان دەریان ئەکەن تا ڕێژەی موسڵمانەکان کەم بێت و ئەو ناوچانە یەکلایی بێتەوە بۆ یاخی یەکانی تامیل.

سەرەتایەك بۆناسینی پڵنگەکانی تامیل،لەبەر ئەوەی گرفتی موسڵمانەکان هۆکارەکەی تامیلی یەکانن بە باشمزانی یاخییەکانی تامیل بناسێنم.

بزووتنەوەی پڵنگەکانی تامیل لە ساڵی ١٩٧٦ دامەزراوە

ئاین : هێندۆس

کێشەیان لەگەڵ حکومەتی سیریلانکا دان نەنانە بە مافی تامیلی یەکانە و لەو کاتەشەوە حکومەت ئاینی وڵاتی کردووە بە بوزی ئەم بڕیارەی حکومەت بۆتە سەرەتای کێشەی تامیلی یەکان.

پڵنگه‌کانی تامیل شۆڕش ئه‌که‌ن تا ناوچه‌یه‌کی سه‌ربه‌خۆی خۆیان هه‌بێت ئه‌وناوچانه‌ی که‌تامیلی یه‌کان زۆرینه‌ن وه‌کو ناوچه‌کانی باکوروڕۆژهه‌ڵات بکه‌نه‌ هه‌رێمێکی سه‌ربه‌خۆ به‌ناوی (تامیلی ئیلام)

له‌ ساڵی ١٩٧٧ هه‌موو تامیلی یه‌کان به‌ره‌یه‌کیان دروست کرد وبه‌شداری هه‌ڵبژاردن یان کردو توان یان چه‌ند کورسی یه‌کی په‌رله‌مان به‌ده‌ست بێنن

له‌ساڵی ١٩٧٨ په‌رله‌منتاره‌ تامیلی یه‌کان له‌په‌رله‌مان کشانه‌وه‌ چونکه‌ حکومه‌ت داوای لێ کردبوون وه‌لائیان هه‌بێت بۆ سه‌ربه‌خۆیی وڵات.

له‌وه‌ته‌ی ئه‌م بزووتنه‌وه‌یه‌ دروست بووه‌ چه‌ند شه‌ڕوو پێکدادانێکی خوێناوی له‌نێوان پڵنگه‌کانی تامیل و حکومه‌تی سیریلانکا ڕوویداوه‌.لای خۆیه‌وه‌ حکومه‌ت له‌پایته‌خت زۆربه‌ی هاوڵاتی یه‌ تامیلی یه‌کانی کوشت تارێژه‌یان که‌م بێته‌وه‌ و به‌پێچه‌وانه‌وه‌ تامیلییه‌کان سینهالییه‌کان یان کوشت تا ئه‌و ناوچانه‌ یه‌کلابێته‌وه‌ بۆ خۆیان ببنه‌ زۆرینه‌.

له‌ساڵی ١٩٧٥ حاکمی ناوچه‌یه‌ی (جافانا ) به‌ده‌ستی پڵنگه‌کانی تامیل کوژرا.٢٣- یۆلیۆ- ١٩٨٣ به‌سه‌ره‌تای شه‌ڕی خوێناوی نێوان حکومه‌ت و پڵنگه‌کانی تامیل دائه‌نرێت.تامیلی یه‌کان ده‌ستیان کرد به‌ ئه‌نجام دانی کرده‌وه‌ی خۆکوژی دژ به‌ سوپای سیریلانکا.له‌ساڵی ١٩٩٣ سه‌رۆکی سیریلانکا به‌ده‌ستی یاخی یه‌کانی تامیل کوژرا.له‌ساڵی ٢٠٠٥ وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ی سیریلانکایان کوشت.له‌و ساته‌وه‌ی شه‌ڕ له‌ نێوان حکومه‌ت و یاخی یه‌کانی تامیل ده‌ستی پێکردوه‌ ٦٤ هه‌زار که‌س کوژراوه‌ .

دڵۆپێك له‌ ئازاری موسڵمانان.

١-لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا ١٠٠ هەزار لە موسڵمانەکان ئاوارە بوون لەو ناوچانەی کە کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی یاخی یەکانی تامیل لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٠.

٢-لەشاری جافانا ٢٨هەزار لەموسڵمانان کەلە ڕەگەزی تامیل بوون ئاوارە بوون و لەژێر خێمە ژیان بەسەر ئەبەن لەوپەڕی حاڵەتی ترس و برسێتی دا ئەژین.

٣-یاخی یەکانی تامیل دەستیان سوورە بە خوێنی هەزارەها موسڵمان جگەلە دەستدرێژیکردنە سەر سەدان ئافرەتی موسڵمان و کوشتنی دەیان لە ئیمامی مزگەوتەکان بەتەنیا لەیەك هێرش بۆ سەر کاروانی حاجییەکان کە لەزیارەتی حەج گەڕا بوونەوە ١٦٨ حاجیان شەهید کرد.

٤-بەهۆی هێرشی یاخی یەکانی تامیل بەهەزارەها موسڵمان ئاوارە بوون و ماڵ و حاڵیان بەجێ هێشتووەو بەسەدەها ئافرەتی موسڵمان بێوەژن کەوتوەو بەهەزاران منداڵ هەتیوو کەوتووە.

٥-حکومەتی سیرلانکا گوێ بە داواکاری موسڵمانان نادات کەداوا ئەکەن لە هێرشی تامیلە یاخیەکان بیانپارێزن.

٥-موسڵمانە تامیلییەکان لەناوچەکانی خۆیان لەلایەن یاخی یە تامیلییەکانەوە دەر ئەکرێن بەتۆمەتی هەڵگەڕنەوە لە ئاینەکەیان و خیانەت کردن.

٦-لەساڵی ١٩٩٠ لەمانگی دیسەمبەر-یاخی یەکانی تامیل هێرشیان کردە سەر هەرێمی (ئیرافۆر) ی موسڵماننشین و ١١٤ کەسیان شەهید کرد کە زۆربەیان ئافرەت و منداڵ بوون جگە لەوەی دەستیان گرت

بەسەر مزگەوتەكان تابەهۆی بڵندگۆی مزگەوتەكانەوە خەڵكی ئاگادار نەكرێنەوە و بتوانن هەڵبێن.

٧-لەساڵی ١٩٩٠ لە ناوچەی (كاتانكۆدی) كەسەر بە هەرێمی (باتیكالۆیە) هێرش كرایە سەر موسڵمانەكان و١٤٠ كەسیان لێ شەهید كراو نامەیەكیان ئاڕاستەی موسڵمانانی ئەم ناوچەیە كرد كە ئەگەر ناوچەكە چۆڵ نەكەن چارەنو سیان كوشتن ئەبێت.

٨-لە ٤-دیسەمبەری- ٢٠٠٧ لەلایەن یاخییەكانی تامیلەوە هێرش كرایە سەر مزگەوتێك لە شاری (ئاكارییاتۆ)و ئەمینداری حیزبی ئیسلامی سیریلانكی و چەند كەسێكی تر شەهید كران.

٩-لە ١٣-دیسەمبەری -٢٠٠٧ سێ موسڵمان یان شەهید كردو لاشەكانیان بردە ئەو گوزەرەی لێ ی ئەژیان فڕیان دا تاببێتە هۆی ترساندنی موسڵمانانی ئەو ناوچەیە.

١٠- بە پێ ی ئامارێكی حكومەت لەماوەی یەك مانگدا ٢٢ موسڵمان شەهید كراوەو ٤٩ كەس بریندار كراوە لە ڕۆژهەڵاتی سیریلانكا كە ئەم ناوچەیە بەدەست یاخی یەكانی تامیلەوەیە.

١١- لە ڕۆژی ١٠-نۆڤەمبەر ٢٠٠٧ بە نارنجۆك هێرش كرایە سەر نوێژ خوێنانی مزگەوتێك و ٤ نوێژ خوێن شەهید بوو ٤٠ نوێژخوێنی دیكەش بریندار.

# چیچان لەنێوان ئازار و هیوادا

کۆماری چیچان یەکێکە لەو هەرێمانەی کە کەوت بووە ژێر دەسەڵاتی یەکێتی سۆڤییەتی جاران،ئەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی ولاتی قەوقاز و،دەورە دراوە بەم ولاتانە: داغستان: لە باکورو ڕۆژهەڵاتی یەوە لەڕۆژئاوایەوە ئەنگۆشیا وئیستونیا و لە باشورەوە جۆرجینیا.

ڕووبەری خاکی چیچان ١٥٣٠٠کلم چوارگۆشەیە وەژمارەی دانیشتوانەکەی (٦)ملیۆن کەسە.سامانی سروشتی زۆرە وەکو نەوت کە زۆر دەوڵەمەندە تێداهەروەها سامانی داری زۆرە جگە لە غازی سروشتی و لە بەر هەمهێنانی بازرگانی خۆراك و ناوچەیەکی بەپیت وبەرەکەتە بۆ کشتوکاڵ بەهۆی ڕوباری تراکەوە کە ئەڕژێتەی دەریای قەزوین.ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەسەدەی ١٣و١٤ زاینی گەشتە ولاتی چیچان وئاینی ئیسلام بلاّو بویەوە. لەسەدەی هەژدەی زاینی دا ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە هەموو هەرێمی چیچان بلاّو بوویەوە لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعین و زۆربەیان ئەهلی تەسەوفن بە هەردوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندین .

شارە گرنگەکانی:گرۆزنی پایتەخت وگوردرمیس و مالکۆبیك و ئەرکۆن و شالی وئۆرس مارتان سەرەتایی چاو تێبڕینی ڕوس بۆ هەرێمی چیچان.لەساڵی ١٨٥٩ زاینی ڕوسەکان هەوڵی داگیرکاری وڵاتی قەوقازییان دا کە هەرێمی چیچان یەکێکە لە هەرێمە گرنگەکانی.

لە هەوڵی دابڕینی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوون تا خەڵکی ئەم ناوچەیە دوور بخەنەوە لە موسڵمانان ئەم سیاسەتە بۆگەنەی ڕووسەکان درێژەی

کێشا هەتا سەدەی بیستەمی زایني،بەڵام گەلی ئیسلامخوازی چیچان زۆر بەتوندی دژی داگیرکاری ڕوس و سیاسەتی دابڕینی ئیسلام وەستانەوە لەژێرفەرماندەی کۆمەڵێك سەرکردەی ئازاو چاونەترس.
له ساڵی ١٩٢٤ هەرێمی چیچان بە تەواوی ئیداری و کارگێری یەوە خرایە سەر حکومەتی سۆڤیەت.ڕوسەکان بەهەموو جۆرێك ئەیانویست ئەم هەرێمە ئازاو ئیسلامخوازە دابڕن له جیهانی ئیسلامی و سەرەتای ئەو سیاسەتە چەوتەیان بە دژایەتی وشە عەرەبیەکان دەست پێ کردو وشەی عەرەبییان گۆڕی بە وشەی لاتینی.

## کۆچپێکردنی بەزۆر

ڕوسەکان هەر لەسەرەتاوە هەوڵیان دا بە هەموو جۆرێك گەلی ستەم دیدەی چیچان بەرەو لاوازی ببەن ئەوەبوو لە ساڵەکانی ١٩٣٧زبۆ ١٩٣٩ز بە هەزارەها کەسیان بەزۆر دەرکرد لەسەر خاکی باوبپیرانیان
له ساڵی ١٩٤٤ جۆزیف ستالینی دڵ ڕەش زۆرێك لە خەڵکی چیچانی ناچار کرد بەئاوارە کردنیان بەرەو کازاخستان و ناوچە ساردو سڕەکانی سیبیریا و بەهەزارەها کەسیان لەبرسانا مرد و لەساردو سەرمایی ناوچەکە ڕەق بوونەوە زۆریکیان بەهۆی سەختی ڕێگاوە هەرلە ڕێگادا تیا چوون.

## ئاواتی سەربەخۆیی

له ساڵی ١٩٩١ گەلی ستەم دیدەی چیچان جاڕی سەربەخۆییاندا وەکو هەموو کۆمارەکانی تری قەوقاز چونکە یەکێتی سۆفیەت هەڵوەشا بووە، بەڵام حکومەتە نەخۆشەکەی کرملن ڕازی نەبوو کە گەلێکی موسڵمانی وەکو چیچان سەربەخۆ ئازاد بژین و دەوڵەتێکی ئیسلامی دروست بکەن بەڵام ئیرادەی ئەو میللەتە بەهێزو ئیسلام خوازە زۆر

لەتانك و زرێپۆشی ڕوسەكان بەهێزتر بوو لە هەڵبژاردنێكی ئازادا جەوهەر موسا داود دۆدایێڤ هەڵبژێرا بەسەرۆكی چیچان و سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند هەتا ساڵی ١٩٩٤ دوای ئەو مێژووە سەرۆكە نەخۆشەكەی ڕوسیا بڕیاری دا هەرچی سوپا بەزیوەكەی هەیە بیكات بە گژ موسڵمانانی چیچان.

موسڵمانانی چیچان بەوپەڕی ئازایەتی یەوە بەرگرییان لە ئاین و خاك و شەرەفی خۆیان كرد چۆكیان بە سوپای ڕوس هێناو سەركەوتنی زۆر گەورەیان بەدەس هێناهەرچەند هێزی یان زۆر نابەرامبەر بوو بەڵام گەلی چیچان بە ئازا و گەلێكی قارەمان و شەڕكەر ناسراون و هیچ كاتێك ژێر دەستەییا ن قبوڵ نەكردووە ئەوان نەوەی پیاوانی وەك و شێخ مەنصوروشێخ غازی مەولای موحەمەدو ئیمام شامیلن كە چۆكیان بە قەیسەرەكانی ڕوس داداو نەوەكانی خۆیان لەسەر جیهاد كردن ڕا هێناوە،ئەو چەكەی جیهادیان پێ كردوە نەوە بەنەوە پاراستویانە.

لە ئێستادا تەواوی خاكی چیچان كەوتۆتە دەست ڕوسەكان،بەڵام موجاهیدانی چیچان كۆڵیان لە جیهاد كردن نەداوە و شەڕێ پارتیزانی ئەكەن وئارامیان لە سوپا لەرزۆكەی ڕوس هەڵگرتووە،بەڵام بەداخەوە جیهانی ئیسلامی لەم موسڵمانە ڕەش و ڕوتانە تەواو بێ ئاگان هەروەها هۆكارەكانی ڕگەیاندنی لەڕوسیا لەسەدا بیست و پێنج ی بەدەست جولەكەوەیە،بۆیە هەواڵی موجاهیدانی چیچان كەمتر هەواڵیان ئەگات بە جیهانی دەرەوە.

ئەوەی ئەم گەلە جیا ئەكاتە بێ لە ئازایەتی و مەردایەتی و خۆڕاگریەكەیان كە دوژمن دانی ناوە بە ئازایەتییەكەیاندا و ئەوەتا مێژوونوسی ڕوسی (فادیڤ) ئەڵێت:ئەگەر جەنگی قەفقاس ئەوەندە

سەخت و درێژ خایەن نەبووایە کەڕێ ی لە بەرەو پێش چونی سوپای ڕوسیا گرت بۆ داگیرکردنی ولاتانی تر ئەوا یەکە سەرباز یە ڕوسی یەکانمان هەموو ناوچەکانی خۆرهەڵاتیان هەر لە میسرەوە تا ژاپۆن بەدەم ئاوازی مۆسقایی سەربازی یەوە داگیر ئەکرد . ئەمە گەورەترین دانپێدانانە لەلایەن دوژمنانەوە بۆ ئازایەتی ئەم گەلە موسڵمانە.
چیچان بە جیا لە هەموو وڵاتە ئیسلامییەکانزۆربەی هەرە زۆری سەرکردەکانی لە ناو مەیدانی جەنگ و جیهادا شەهید بوون وەکو شێخ مەنصورو شێخ غازی مەولای موحەمەدو ئیمام شامیل و جەوهەر دۆدایڤ و ئەسلان مەسخادۆڤ وشامیل باسایڤ و خەتاب و چەندەهای تر،لێرەشدا تەنها ئاماژە بە ژیانی سەرکردە جەوهەر دۆدایڤ ئەدەین:
جەوهەر دۆدایڤ کیٚ یە؟
ناوی تەواوی (جەوهەرموسا داود دۆدایڤ)،لە ساڵی ١٩٤٤ لە گوندی یالهور لە چیچان لە دایك بووە
پەیمانگای باڵای جەنگی و ئەکادیمیای فرۆکەوانی تەواو کردوە،ژەنەڕاڵێکی پلە بەرزی ئاسمانیی سۆڤیەت بووە،لە ساڵی ١٩٩١ سەربەخۆیی وڵاتەکەی راگەیاند،لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٤ وە دژی سوپای ڕوسیای داگیر کەر لە پێناوی سەربەخۆیی وڵاتەکەی دا دەستی بەجیهاد کرد،لە ڕۆژی یەك شەممە ٢١-٤-١٩٩٦لە بۆردومانێکی ئاسمانی دا شەهید بوو.

بەرەنگاریی گەلی چیچان

لێکۆڵەرەوەیەکی گەورەی ڕوسی بەناوی ئەلسکەندەر باستریکین لە لێدوانێکی دا بۆ ئاژانسی دەنگوباسی ئەنتەرفاکسی ڕوسی ئاماژەی بەوەدا کە حکومەتی ڕوسی نەیتوانیوە بەر بە بەرەنگاریی گەلی چیچان

بگرێت،بەڵکو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هێرش و تەقاندنەوەی مین بەبەرپرسان ڕوو لەزیادبووندایە بەتەنها لەساڵی ۲۰۰۹ دا (۵۱۳) هێرش و پەلامار لەلایەن موجاهیدانەوە ئەنجام دراوە کە زۆر جار چالاکییەکان ئەبەنە دەرەوەی خاکی چیچان،ئەمەش ئەوەندەی تر حکومەتی ڕوسی ڕوو ڕەشتر کردووە و ترس و دڵە ڕاوکێ ی خستۆتە دڵی سەرانی ڕوسەوە.بەهێزی ئیرادەو دامەزراوی ئیمانی ئەو گەلە موسڵمانە دەر ئەخات کە بەدرێژای مێژوو زیلەت و ژێر دەستەییان قبوڵ نەکردووە.

# قیرغیزستان

قیرغیزستان یەکێکە لە ولاتەکانی کیشوەری ئاسیاو دەوورە دراوەبە ولاَتانـــەی لای خوارەوە،لەڕۆژهەلاَتـــەوە تورکمانـــستانی ڕۆژهـــەلاَت (کەئێستا بەشێکە لەخاکی چین )لەباکورەوە کازاخستان ولە ڕۆژئاواوە ئۆزبەکستان لەباشوری خۆرئاواوە تاجیکستان.

پایتەخت :بیشکیك

ڕووبەری خاکەکەی :١٩٨٥٠٠ کیلۆمەتر

ژمارەی دانیشتوان : ٥١٤٦٣٠٠٠ کەسە

ئاین : موسڵمان لە ٨٠٪

مەسیحی ئەرسەدۆکسی ١٨٪

بووزی :٢٪

ڕەگەز : ئۆزبەکی .تەتار . ئیغۆر . قیرغیزی . تورکمان . ئۆکرانی . ڕووسی

بنەچەی ڕەگەزی قیرغیزی تورکن و سەر بە مەغۆلن.

ژمارەی مزگەوت : ٢٥٠٠ مزگەوت

زانکۆی ئیسلامی :٦ دانە

٥٤ خوێندنگەی ئیسلامی

لەساڵی ١٨٦٦ قەیسەرەکانی ڕووس چاویان بڕیە ئەم ولاَتە.

لەساڵی ١٩٢٦ خرایە سەریەکێتی سۆڤیەتی جاران.

لەساڵی ١٩٩١ کاتێك یەکێتی سۆڤیەت لەبەر یەك هەڵوەشایەوە سەربەخۆیی خۆی وەرگرت.

ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی قیرغیزستان

ڕووسەکان زۆر له خەڵکی ئەم ناوچەیە ئەترسان لەبەر ئەوەی ئەیانزانی وڵاتـــێکی شـــاخاوی ســـەختەو هـــەم زۆر دووره لـــه مۆســـکۆی پایتەختەوە،بۆیـە کاتێـك ئـەم ولاتـەیان لەسـاڵی ١٩١٦ داگیرکـرد لـەو ساڵەدا ١٥٠ هەزار قیرغیز یان کوشت و زۆرێك لەخەڵکی ئەم ولاتە یان ئاوارە کردو لەڕێگەدا له برسێتی و سەرمادا مردن.

ڕووسـەکان زۆرێـك لەخـەڵکی ئـەم ناوچـەیان ناچارکرد ئـاوارە ببن بـۆ وڵاتـی سـیبریا،بە پێـچەوانەوە حکومـەتی ڕووس لەخـەڵکێکی زۆری لـە ڕووسـیاوە هێنـا بـۆ قیرغیزسـتان تـا نفـوزی خـۆی زیـاد بکـات لـەم وڵاتەدا،بەتایبـەت لـە جـەنگی دووەمـی جیهـانی دا ئەوەنـدە خـەڵکی ڕووسی هێنابوو له نیوه زیاتری وڵات بوو بوو بەخەڵکی هاوردە.

بـەهۆی داگیرکـاری ڕووسـەکانەوە زۆرێـك لەخـەڵکی ئـەم وڵاتـە ئـاوارەی وڵاتی چین و ئەفغانستان بوون.حکومـەتی مۆسـکۆ بۆ دژایـەتی کردنـی ئاینی ئیسلام له ساڵی ١٩٢٨ پیتی عەرەبی قەدەغه کرد و لەبریدا پیتی لاتینـی کـرده فـەرمی.حـوکمی شـیوعی یـەکان بـەردەوام بـوو تاسـاڵی ١٩٩١و لەو بەروارەوە سەربەخۆیی خۆی وەرگرت.

گەشتنی ئاینی ئیسلام بەقیرغیزستان

ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەدوای شـەڕی خۆراسانەوەگەشـته ئـەم ناوچـەیە بەتایبەت له نزیك کۆتایی سـەدەی یەکـەمی کۆچـی لەنێوان سـاڵی ٩٤-٩٦ کۆچی سوپای ئیسلام بەسـەرکردایەتی قوتەیبیـەی کـوڕی موسـلیم گەشـته ئـەم ناوچـەیە.لەسـەردەمی عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز تیـشکی خۆری ئیسلام گەیشته سەرانسەری وڵات.

لەسەردەمی عەباسی یەکان کاتێك دامەزرێنەری دەوڵەتی خەواقین موسڵمان بوو ( خاقان ستۆق بوغرات ) بوو بەهۆی زیاتر بڵاو بونەوەی ئاینی ئیسلام لەناوچەکەدا.

جگەلەم هۆکارانە بازرگانە موسڵمانەکانیش بەهۆی کاروانە بازرگانیەکانیانەوە بەڕێگای ئاوریشم کە بەم ناوچەیەدا تێپەڕ ئەبوو بەهۆی ڕەوشتی جوانیانەوە ئاینی ئیسلامیان بڵاوئەکردەوە.یەکێك لەبازرگانە بانگخوازەکان (ئیسحاق وەلی ) بوو کە بۆ ماوەی ١٠ ساڵ خەریکی کاری بانگخوازی بوو،دواتر موسڵمان بوونی تەتارو مەغۆلەکان هۆکارێکی تر بوو بۆ زیاتر بڵاوبوونەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەتا سەردەمی داگیرکاری ڕووسەکان لە ساڵی ١٨٦٦ زاینی.

### *ئازاری موسڵمانان لە قیرغیزستان*

١- *هەڵوەشاندنەوەی* یەکپارچەیی و یەك زمانی هەموو ئەو ناوچانەی بەتورکمانستانی ڕۆژهەڵات ناسراوو بوون کە بریتی بوون لە (قیرغیزستان – ئۆزبەکستان – کازاخستان – تورکمانستان – تاجیکستان )کە پێشتر هەموویان بە پیتی عەرەبی ئەیاننووسی،بەڵام ڕوسی داگیرکەر پیتی عەرەبی یاساغکردوو پیتی لاتینی دانا.

٢- دابڕینی هەموو پەیوەند ییەکی ئەم وڵاتە بە ئاینی ئیسلامەوە.

٣- دابڕینی ڕۆشنبیری ئیسلامی لەم وڵاتەدا.

٤- پچڕاندنی هەموو پەیوەندی یەك لەنێوان قیرغیزستان و وڵاتە ئیسلامی یەکانی ناو یەکێتی سۆڤیەت و دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت.

٥- ڕێگری لەموسڵمانەکان لە فێربوونی قورئان و زانستە ئیسلامییەکانو گرتنی هەرکەسێك هەوڵی ئەو شتانە بدات.

٦- قەدەغە کردنی بانگ و ڕۆژوو گرتن.

٧- داخستنی زۆربەی مزگەوتەکان: زۆرێك لە مزگەوتەکان کران بە شوێنی هەڵگرتنی داودەرمانی شوێنی ئاژەڵ بەخێو کردن.

٨- دژایەتی کردنی سەرپۆش وحیجاب تەنانەت لە دامو دەزگاحکومییەکان و لەناو قوتابخانەکان بالآپۆشی قەدەغە کرا.

٩- بلاٌوو بوونەوەی جۆرێك لەعادەتی جاهیلی کەبەر لە ئاینی ئیسلام لە ناویان دا باوبوو،ئەویش ڕفاندنی ئافرەت ( واتا ڕەدوو کەوتن) و بەزۆر ناچار کردنی کە شوو بکات بە کابرای ڕفێنەری کە خۆیان بەم عادەتە ئەڵێن جۆلۆك.

١٠-بوونی کۆمەڵەو ڕیکخراوی تەنصیری یەکان .

# ئازاری موسڵمانان لە کازاخستان

کازاخستان ئەکەوێتە ناوەندی کیشوەری ئاسیاو دەورە دراوە بەم وڵاتانە:ئۆزبەکستان وقیرقیزییا لەباشورەوە لەڕۆژهەڵاتەوە چین لەباکورەوە یەکێتی وڵاتە کۆمارییەکانی ڕوسیا و دەریایی قەزوین لەڕۆژئاوەوە.

زمان : کازاخی و ڕووسی

ڕووبەری خاکەکەی :١٤٣١٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە

ژمارەی دانیشتوان :٢٦ملیۆن کەسە

پایتەخت : ئاستانە (ماتی پایتەختی کۆنی کازاخستان بووە)

شارە گرنگەکانی : ماتی . کاراغاندا .شیمکینت .ئەتراوا . ئەکتاو

دراو:تینجی کازاخی

پێکهاتەی موسڵمان و غەیرە موسڵمان

موسڵمان: ٦٠٪

مەسیحی ئەرسەدۆکس ٣٠: ٪

پرۆستانت: ٣٪

ئاینی تر:٧٪

ڕەگەزی کازاخی: ٥٣٪

ڕوسی: ٣٠٪

١٧٪ ڕەگەزی تر

پارتی سیاسی :١١ پارت

لە ساڵی ١٩٩١ سەربەخۆیی خۆیی وەرگرت لە ڕوسیا

ئاینی پیرۆزی ئیسلام دوای فەتحی خۆراسان گەشت بەم ناوچە

ئـەو وڵاتانـەی کەوتنـە پـشت ڕووبـارەوە فـەتح کـران بەسـەرکردایەتی قوتەیبیەی کوڕی موسـلیمی باهلی لـە ساڵی ٨٨ کۆچی توانی فەتحی ولاتانی پشت ڕووبار بەرێتە قۆناغێکی نویێ و دواتر بوخارای گرت و لە قۆناغی سێ یەمدا ٩٠ کۆچی بۆ ٩٣ کۆچی توانی ئاڵای ئیسلام بەرز بکاتـەوە لـە ناوچـەی حـەوزی جـەیجون لـە قۆنـاغی چوارەمی فوتـاحتی ئیسلامی ناوچە کانی دەریـای جـەیحون لـە ٩٤ کۆچی بـۆ ٩٦ کۆچـی فـەتح بکـات دوای ١٤ سـاڵ لـە جیهـاد کردنـی بـەردەوام تـوانرا شـاری کەشغەر لە سەر سنوری ولاتـی چین فەتح بکـات بەمـەش سـەرکردەی پاڵەوان قوتەیبەی کوڕی موسلیم توانی بانگەوازی ئیسلامی لە ناوچەی پـشت دەریـای جـەیحون بڵاوبکاتـەوە.سـەرکردە عومـەری کـوڕی عەبـدول عەزیز داوای لەسەرکردەو فەرمان ڕەوایانی ئەو ناوچەیەکرد موسڵمان بێن و زۆرێکیان ئاینی ئیسلامیان قبوڵ کرد.لەم ناوچەیە ئاینی پیرۆزی ئیـسلام بەشـێوەیەکی بـاش بڵاوبووەیـەو بەتایبـەت پـاش ئـەوەی لەسەردەمی عەباسییەکان لە خەواقییەکان ئال بوغرا موسڵمان بوون.

پاش ئەوەی مەغۆلەکان موسڵمان بوون،ئاینی ئیسلام گەشـەی زیـاتری کـرد لـەم ناوچـەیەدا،بەتایبـەت لـە سـەردەمی ئـەمیری مـەغۆل بەرکـەخان ئاینی ئیسلامی بڵاوکردووە بە هەموو وڵاتی ڕووسیادا.

هەرچـەندە قەیـسەرەکانی ڕووس زۆرجـار هـەوڵیان ئـەدا دەسـتبگرن بەسەر ئاسیادا،ئەوە لەسەدەی هەشتەم و نۆیەم دا توانییـان بۆ مـاوەی ١٨٢ ساڵ ئاسیای ناوەند ملکەچ بکەن.

دواتر شیوعی یەکان دەستیان کرد بە شاڵاوی داگیرکاری بۆ سەر وڵاتە ئیـــسلامی یەکان،بـــەڵام گـــەلانی موســـڵمانی بەرپەرچـــی شـــاڵاوی شیوعییەکانیان دایەوە.

دەست بەسەراگرتنی کازاخستان لەلایەن شیوعییەکانەوە

هـەوڵی قەیـسەرەکانی ڕووس و پاشـان شـیوعیەکان بـۆ داگیرکـاری ئاسیای ناوەند و لکاندنی ئەم ناوچانە مێژوویـەکی درێژی هەیە،بەڵام گـەلانی موسـڵمانی ئـەم ناوچـانە دژ بـە هـەموو داگیرکـاری یـەکان وەستانەوە،تا سالّێ ١٩٣٤زاینـی توانییـان دەستی چەپەڵیان بگەینـە هـەرێمی کازاخستان.لـە سالّێ ١٩٣٦ زاینـی هـەرێمی کازاخـستانیان خـستە سـەر یـەکێتی کۆمنیـسێتی ڕوسـی کـەپێکهاتبوو لـە ڕوسـیای ئیتحـادی و کرابینیـا و ڕوسـیای سـپی و ئۆزبەکـستان.دوای دەسـت بەسەردا گرتنی ئەم هەرێمە حکومـەتی شیوعی پلانـی گلاّووی دانا بۆ لەناو بردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام

کاتێك ئەم گەلە موسڵمانە بوون بە ژێر دەستەی شیوعی یەکان یەکسەر بڕیار درا ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەم گەلە وەر بگرنەوە ئەویش بەم جۆرە

١- سـەرجەم خوێندنگـە ئیـسلامی یـەکانیان لەسەرانـسەری ولات داخست

٢- هەموو مزگەوتەکانیان داخست تا چیتر موسڵمانان گوێیـان لە دەنگی بانگیش نەبێت

دواتر ڕووسەکان کازاخستان یـان کرد بـە شوێنی تـاقی کردنـەوەی چـەکی ئـەتۆمی بەمـەش زیـاتر لـە ١٠٠ هـەزار کـازاخی مـردن و نزیکەی ٢٩ هـەزار منـداڵ بەر لـەدایك ببن وەفات یان کرد جگـە لـە بـڵاو بوونـەوەی جۆرەهانەخۆشـی دەرونـی وشـێرپەنجەبەهەموو جۆرەکانییەوە بەهۆی تیشکی ئەتۆمەوە

دوای شکانی شیوعی یەکان و حاڵی موسڵمانان

دوای سەربەخۆیی کازاخستان لە ساڵی ١٩٩١ کۆمەڵێك خەڵکی عەلمانی پاش ماوەی شیوعی هاتنە سەر حوکم کە بەهیچ جۆرێك ئاینی ئیسلامیان پێ قبوڵ نەبوو نەیانئەویست ئاینی ئیسلام یاسای دەوڵەت بێت تەنها چەند شتێکی رووکەشیان کرد بۆ ئەوەی گەلی موسڵمانی کازاخی رقی پیرۆزی نەرژێت بەسەریاندا هەندێك مزگەوتیان کردەوەو بەرووکەشی رێگری یان نە ئەکرد لە چالاکی موسڵمانان بەڵام نزاربایف زۆر بەراشکاوانە دژایەتی خۆی بۆ ئاینی ئیسلام دەربڕی و بەهیچ جۆرێك رازی نەبوو ئاینی ئیسلام بکرێت بەدەستووری ئەم گەلە موسڵمانە کە بەدرێژایی چەند سەدەیەك لە خزمەت ئاینی پیرۆزی ئیسلام دا بوون.رێگەی بەدروست بوونی هیچ پارتێکی ئیسلامی نە ئەدا بە بیانووی ئەوەی نەبادا پارتە ئیسلامییەکاندەست بدەنە چەك و بێنە سەر حوکم،بەڵکو دوای رووداوی یانزەی سێبتەمتبەری ئەمەریکا حکومەتەکەی نزاربایف دەستی کرایەوە بۆ زیاتر دژایەتی کردنی موسڵمانان بەهەموو جۆرێك حیجابی قەغە کردوو بەسەدەها ئافرەتی باڵاپۆشی ناچارکردلەچکەکانیان لەسەریان بکەنەوە . هەرچی بنکە وناوەندی لەبەر کردنی قورئان بوو لەسەرانسەری ولات دا دایخست و دەستی کرد بە گرتنی سەرجەم چالاکەوانە موسڵمانەکان بە جۆرێك راپۆرتە نێودەوڵەتییەکان ئاماژەیان بەو رێگر یەکردووە کە حکومەتەکەی نزاربایف بەرامبەر ئازادی ئاینی پەیرەوی ئەکات

**به کورتی**

**حاڵی موسـڵمانان لـه کازاخـستان وەکـو زۆربـەی ولاتـانی تـری موسڵمانشین وایه زۆرینەیەکی موسڵمان بەدەست کەمینەیـەکی بێ دینەوە گرفتار بوون که بەهەموو جۆرێك دژایەتی موسڵمانان ئەکەن و رێگـری حیجـاب وقەدەغـەکردنی چـالاکی ئیـسلامییەکانئەکەن بەپاساوی تـیرۆرەوە رێگـری ئەکـەن لـه نـەوەی موسـڵمانان تـافێری قورئان و شارەزای دینەکەیان بن بەناوی کۆنەپەرستی یـەوە لـەتازه تـرین ئیبـداعی حکومەتـه لەرزۆکەکـەی نـزار بـایف بڕیـار دراوه کـه بڵنـدگۆی مزگەوتـەکان لابرێـت گوایـه بڵنـدگۆ بیدعەیـه ولـه زەمـانی پێغەمبەرداصلی الله علیه وسلم دا نەبووه !!!**

# ئازاری موسلمانان له کشمیر

کشمیر یەکێکە لە خۆشترین ولاتەکانی دنیا شوێنی هەلکەوتنی جوگرافی زۆر گرنکی هەیە کەوتۆتە باشوری کیشوەری ئاسیاو دەورە دراوە بەم ولاتانە:لە ڕۆژهەلات و باکوری ڕۆژهەلاتەوە چین،لە باکورەوە ئەفغانستان. لەباشووری خۆرئاوەوە پاکستان .لە باشورەوە هیندستان.

ڕووبەری خاکەکەی : ٢٤٢٠٠٠ کیلۆمەترە چوارگۆشەیە

ژمارەی دانیشتوان : ٦ ملیۆن کەسە

موسلمان :٢ .٦٤٪

سیخ :٢٥. ٣٢ ٪

بوزی و مەسیحی: ٣٢. ٢ ٪

پێکهاتەی ڕەگەزی لە کشمیر بەم جۆرەیە (ئاری یەکان . تورك . مەغۆل .ئەم پێکهاتە جیاوازانە ئەچنەوە سەر ئەم ڕەگەزانە (کوشر و دوغری و باهاری )

زمان . بەکشمیری و هیندی و ئۆردوی قسەئەکەن و بەپیتی عەرەبی ئەنوسن.

هەرێمی کشمیر لە پێنج ناوچە پێکدێت کە ئەمانەن (دۆلی کشمیر. جامۆ. لاداخ .بۆنش .بلتستان .جەلجەت)

٥٣٦٦٥میل بە دەست هیندستانەوە یە پێی ئەلێن جامۆکشمیر( پایتەختی هاوینەی ناوی سرینغارەو پایتەختی زستانەی ناوی جامۆ یە

٣٢٣٥٨میلی بەدەست پاکستانەوە یەو پێی ئەڵێن کشمیری ئازاد پایتەختە کە ی ناوی مزەفەر ئابادە
بەشێکی بچوکی لەساڵی١٩٦٢ وەبەدەست چینەوە یە پێی ئەڵێن ئەکسای تشین.
ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی كشمیر
كشمیر یەكێكە لە وڵاتە پڕ لە كێشە كانی دنیا بە درێژای مێژوو ململانێی تێدا بووە . هۆكاری كێشەو فیتنەی تایفی و سیاسیی هەبووە بەتایبەت لە نێوان بوزی و بەراهمی یەكان.زۆرتر هۆكارە دینی وسیاسیی و كۆمەڵایەتییەكان بوونەتە هۆی دروست بوونی كێشە لە هەرێمی كشمیر.هەرێمی كشمیر لە سەدەی نۆیەمی زاینی تا دوانزەی زاینی ئارامی بە خۆە بینی.موسڵمانەكان نزیكەی ٥ سەدەی باڵا دەست بوون لە هەرێمی كشمیر ،لە ساڵی ١٣٢٠ بۆ ١٨١٩ .
ئەتوانین ئەو ماوەیە بەم جۆرە دابەش بكەین
حوكمی سوڵتانەكان ١٣٢٠ – ١٥٦٨
حوكمی مەغۆل ١٥٦٨ – ١٧٥٣
حوكمی ئەفغانی یەكان ١٧٥٣ – ١٨١٩
لەسەدەی چواردەی زاینی گۆڕانكا ییەكی زۆر گرنگ ڕوو یدا ئەویش موسڵمان بوونی ڕ ینجن شاە حاكمی بوزییەكان بوو (ناوی خۆی گۆڕی بۆ صدرالدین) بەهۆی بانگخواز بولبول شاهەوە كە تەواوی دەسەڵاتدارەكان لە گەڵی موسڵمان بوون.
بەهۆی موسڵمان بوونی حاكمەوە ئارامی و ئاسایش باڵی كێشایەوە بەسەر تەواوی كشمیر دا و هەموو لایەك بە ئارامی ئەژیان.

کشمیر لەژێر فەرمانڕەوای موسڵمانەکان مایەوە تا سەدەی نۆزەدەهەمی زاینی لە ساڵی ١٨١٩ زاینی سیغەکان دەستیان بەسەر هەرێمی کشمیردا گرت تا ساڵی ١٨٤٦ زاینی کشمیر بەدەست سیغەکانەوە مایەوە.

لە ساڵی ١٨٤٦ زاینی بەریتانیا دەیستی گرت بەسەر هەرێمی کشمیرداو،دواتر بەریتانی یەکان بۆدروست کردنی ئاژاوە هەرێمی کشمیریان فرۆشت بە حەوت ملیۆن و نیو ڕوپی یەی بە هیندی یەکانی هۆزی دۆغرا.

بارو دۆخی سیاسی لە کشمیر

لە ١٧ – تەموزی – ١٩٤٧ هیندستان سەربەخۆیی خۆی وەرگرت و لەژێر داگیر کاری بەریتانیا دەرچوو .لە ١٥ – ئابی – ١٩٤٧ بڕیارەکە جێ بەجێ کرا.

بەریتانییەکان وایان پێ باشبوو کە خەڵکی هەرێم و ناوچە جیاوازەکانی هیندستان خۆیان بڕیار بدەن لە گەڵ هیندستان ئەمێننەوە یاخوود ئەبن بەبەشێك لە پاکستان.

حەیدەر ئاباد . جۆناغاد و کشمیر سێ هەرێم بوون کە موسڵمان و هیندۆسی تێدا بوو حاکمی جۆناغاد موسڵمان بوو ویستی ببن بەبەشێك لە پاکستان،بەڵام حکومەتی هیندی بە زۆری هێز بڕیاری دا کە بخرێتە سەر هیندستان.

حەیدەر ئابادیش بە هەمان شێوە لە ١٣ – ئەیلول – ١٩٤٨تەداخولی کردو خرایە سەر هیندستان.

هەرێمی کشمیر لەلایەن حاکمێکی هیندۆسەوە ئەبرا بەڕێوە بەناوی هاری سینغ ئەویش بڕیاری دا هەرێمی کشمیری موسڵمان بخرێتە سەر هیندستان لە کاتێك دا گەلی موسڵمانی کشمیر ئەیانویست بخرێنە سەر پاکستان،بەڵام ئەم زوڵم زۆرە کە لەلایەن هیندستانەوە ئەکرا لەو گەلە موسڵمانانە سەری کێشا بۆ شەڕێکی درێژ خایەن.

١-شەڕی ١٩٤٧ – ١٩٤٨

بارودۆخی کشمیر زۆر بە خێرای تێئەپەڕی هەموو ڕووداوەکان ئاماژەیان بۆ شەڕ ئەکرد،چونکە هیندستان دژی ویستی گەلی موسڵمانی کشمیر بوون،لەساڵی ١٩٤٧ شەڕ لە نێوان کشمیرو هیندستان ڕوویدا.هیندستان توانی دەستبگرێت بەسەر سێ بەشی خاکی کشمیر.نەتەوە یەکگرتوەکان و ئەنجومەنی ئاسایش لە ١٣ – ٨– ١٩٤٨بڕیارن دەرکرد،لە بڕیارەکەدا هاتبوو کە پێویستە شەڕ لە نێوان هەردولادا ڕابگیرێت و ڕاپرسی ئەنجام بدرێت گەل خۆی بڕیاری چارەنوسی خۆی بدات.ئەو کات نەتەوە یکگرتوەکان وا یان بەباش ئەزانی کە هەرێمی کشمیر دابەش بکرێت لە نێوان هیند و پاکستان،وا بڕیار درا بوو هەرناوچەیەك موسڵمانەکان زۆریینە بوون بدرێت بە پاکستان و هەر ناوچەیەك هیندۆسی تێدا زۆریینە بوو بدرێت بە هیندستان.ئەو ناوچانەی کە موسڵمانەکان زۆرینە بوون نزیکە ١٠٠٠ کیلۆمەتر بوو،ئەو ناوچانەشی کە هیندۆس تیدا زۆرینە بوون نزیکەی ٣٠٠ کیلۆمەتر بوو،کەچی ئەو بڕیارە تەنها لە سەرکاغەز بوو نەچووە بواری جێبەجێ کردنەوە.

٢- شەڕی ساڵی ١٩٦٥ هەڵگیرسا و هیچ کام لەهەردوو دەوڵەت هیندستان و پاکستان نەیانتوانی سەرکەوتنی یەکلاکەرەوە بەدەست بێنن.

٣- کۆنگرەی تەشقەند ئەم کۆنگرە نەگەشتە هیچ ئەنجامێك پاش ماوەیەك لە وتوێژی دوولایەنە،دواتر بەهۆی مردنی لە ناکاوی سەرۆك وەزیرانی هیندستان شاستری کۆنگرەکە شکستی هێنا.

٤- شەڕی ساڵی ١٩٧١

ئەم شەڕە لە بەرژەوەندی هیندستان کۆتایی هات چونکە توانی بەشێك لە پاکستان جیا بکاتەوە لەڕۆژهەڵاتی پاکستانەوە بە هاوکاری هیندستان جاڕی سەربەخۆیی داو ناونرا کۆماری بەنگلادیش.

٥- پەیمانامەی شەملا ١٩٧٢

ئەم ڕێکەوتننامەیە کۆتایهات بە ئاگربەست بەو جۆرە ڕێکەوتن کە هیندستان ئەو زەوی یانەی کە لە شەڕی ١٩٧١ گرتویەتی نەیداتەوە بە پاکستان کە ئەم بەشانە بوون کاغیل و نیسوال و بۆنش،هەروەها پاکستانیش بە هەمان شێوە خاکی تشامب کە لە شەڕێ ١٩٧١ دەستی بەسەردا گرت بوو نەیداتەوە بە هیندستان.

## بزووتنەوی بەرگری گەلی کشمیر

موسڵمانانی کشمیر لەسەردەمی فەرمانڕەوایی خانەوادەی دوغرا زۆر ئازاریان چەشت بوو لە ڕووی ئاینی و ئابووری و سیاسیی یەوە موسڵمانانی ئەچەوساندەوە،بۆیە یەکەم حیزبی ئیسلامی

بەناوی یەکێتی لاوانی موسڵمان لەسەردەستی تشۆدری غولام عەباس لە ساڵی ١٩٢٢ دامەزرا.

لە ساڵی ١٩٣٢ کۆنگرەی موسڵمانانی جامۆکشمیر بەسەرکردایەتی شێخ موحەمەد عبداللە دامەزرا.لە دوای سی یەکانی سەدەی ڕابردوو بەهۆی کاریگەری حیزبی کۆنگرەی نیشتیمانی هیندی کە دروشمی هیندستان یەك گەلە یان بەرز کردبووە زۆرێك لە خەڵکی ئەوبیرو ڕایەیان لادروست بوو کە هەموو گەل و هۆزو ئاینە جیاوازەکان ئەتوانن لە یەك دەوڵەت دا بژین بە بێ جیاوازی بۆیە شێخ موحەمەد عبداللە کاریگەر بوو بەو بۆچونەو ناوی حیزبەکەی گۆڕی بۆ کۆنگرەی نیشتیمانی،بەڵام تشۆدری غولام عەباس ڕەتی ئەو بیرو بۆچوونەی کردو سور بوو لە سەر ئەوەی کە کشمیر ببێت بە بەشێك لە پاکستان.بەهۆی پێداگری ئەوەوە کۆنگرەی موسڵمانانی کشمیر١٩ – تەموزی – ١٩٤٧ بەشێك لە کشمیریان خستە سەر پاکستان.

لە دوای هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٧ چەند ڕێکخراوێکی سیاسی و سەربازی دروست بوون و هەموویان داوای ئازادی بۆ کشمیر ئەکەن.

## سیاسەتی هیندۆسە کان دژ بە موسڵمانان

ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە ئەفەرموێت کوفر یەك میللەتە لە ئێستاو لە مێژووی کۆنیش دا هەروا بووە،سەیری هەموو میللەتە موسڵمانەکان بکە کە ژێر دەستەی گەلێکی کافر بوون

بەیەك جۆر ئازار دروان و ئازار ئەدرێن و یەك جۆر مامەڵەیان لەگەڵدا ئەكرێت.

ئەوەی لە خوارەوە ئاماژەی پێ ئەدەین دڵۆپێكە لەو ستەمەی كە مانگا پەرستەكانی هیندۆس لەو بەشەی كشمیر كە بەدەستیانەوە یە دژ بە موسڵمانەكان ئەنجامی ئەدەن.

١- گۆڕینی پڕۆگرامی خوێندن تا ئاینی ئیسلام لەبیری منداڵانی كشمیر ببنەوە.

٢- قەدەغەكردنی وانەو دەروی خوێندنی قورئان و سوننەتە بەرزەكانی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم).

٣- بڵاوكردنەوەی گوناه و تاوان لە پەیمانگاو كۆلێژەكان.

٤- هاندانی خەڵكی بۆ ڕووتی و بەڕەڵایی.

٥- هاندانی هاوسەرگیریكردن لە نێوان هیندۆس و موسڵمانەكان.

٦- سیاسەتی پەرتكردنی موسڵمانان.

٧- قەدەغە كردنی سەر بڕینی مانگا.

٨- بڵاوكردنەوەی ئارەق و ماددەی هۆشبەر.

٩- دروستكردنی سینەماو یانەی شەوانەو مەلهاو پارێزگاری كردن لێ یان.

١٠- ڕێگری كردن لە فرەژنی.

١١- بڵاوكردنەوەی نەخۆشی نەزۆكی لەڕێگەی خواردن و دەرمانەوە.

دڵۆپێك لە ئازاری پڕ ستەمی بەندەكانی مانگا دژ بە موسڵمانانی كشمیر:

١- شەهیدكردنی ٢١٧٨٠ موسڵمان.

٢- بریندارکردنی ٢٢٠٠٠ ژن و پیاو.

٣- سوتاندنی ٢٢٠ خوێندکار منداڵ بەزیندویی له ناوچەی سبوارا.

٤- ڕوخانی بیانی قوتابخانه یەك بەسەر ٤٠٠ قوتابی منداڵ دا.

٥- بەند کردنی نزیکەی ٨١٠٠٠ له موسڵمانانی کشمیر که بەجۆرەها شێوەی وەحشیگەرانه ئازارو ئەشکەنجه ئەدرێن.

٦- سوتاندنی ٥٥٠ مزگەوت و پەیمانگای ئیسلامی.

٧- سوتاندنی ٢٠٠٠٠ کۆگا و دوکانی موسڵمانان.

٨- دۆزینەوەی ٤٠٠ ئافرەتی موسڵمان له ڕووبارەکانی کشمیر.

٩- کوشتن و بڕینی هەزارەها سەر ئاژەڵی موسڵمانان لەگەڵ تێکدانی هەزارەها ڕەزو باخ.

١٠- ئاوارە بوونی ٤٢٧٧٤ هەزار کەس بۆ سەر سنورەکان.

١١- بێسەروشوێن بوونی ١٥٠٠ کەس که تائێستاچارەنوسیان دیار نی یه.

١٢- کوشتنی ١١٠ ئافرەت به ئیغتیساب.

١٣- کوشتنی ٢٣٠ منداڵ بەهۆی ئاوارە بوون و نەبوونی خواردن مردن لەبرسا.

# ئازاری موسڵمانان لە وڵاتی چین

وڵاتـی چـین یەکێکـە لـە وڵاتـە گـەورەکانی جیهـان لـە ڕووی ژمـارەی دانیشتوان و ڕووبەری خاکەکەیشیەوە،چونکە ژمارەی دانیشتوانی یەك ملیارو سێ سەد هەزار کەس زیاترە کە ئەکاتە یەك لەسەر شەشی جیهان،ڕووبەری خاکەکەشی ١٠٦ ملیۆن کیلۆمەتر چوار گۆشەیە کە ئەمـەش سـێ هێنـدەی خـاکی فەڕەنسا ئەبێت،جگـە لـەوەی لـە ڕووی سامانی سروشـتیەوە خـاوەن ٨ ملیـار تـەن نـەوتی یەدەکـەو خـاوەنی پێگەیـەکی بـەهێزی ئابوریـشە کـە تـەنیا سـاڵی ٢٠٠٨ لەگـەڵ وڵاتـە عەرەبیـەکان سـەرمایە بازرگانییەکـەی گەشـتە (١٣٣)ملیـار دۆلار.ئـەم ژمارەیە ساڵ لە دوای ساڵ ڕوو لە زیاد بوونە بە ڕێژەی ٤٠٪ ،وە ئاینی پیرۆزی ئیسلام لـە زەمانی خەلیفەی سێیەم عوسمانی کوڕی عـەففان ڕەزای خوای لێبێت گەیشتە وڵاتی چین ئـەویش بە دوو ڕێگا،یەکەمیان ڕێگای وشکانی کە بەڕێگەی ئاوریشم ناسراوە و لە ڕێگەی موسڵمانە فارسـەکانەوە ئیـسلامیان پێـی گەیـشتوە،بۆیە ئەگـەر سـەیر بکـەیت ئێستاش هەندێ وشەی فارسی ئەبینی لە زمانی موسڵمانەکانی وڵاتـی چین وەك (نوێژ) ئـەوان پـێ ئـەڵێن (نمـاز)،ڕێگـەی دووهـەم لـە ڕێگـەی ئـاوەوە-بازرگانـە موسـڵمانەکانی لـە حەزرەمـەوت و بـاکوری یەمـەن ئیسلامیان گەیانـدە ئەندەنوسـیاو باکوری چین،بۆیە ئـاینی ئیـسلامی مێژوویـەکی دوورو درێـژی هەیە لـە وڵـاتی چین،بەڵام موسڵمانانی ئـەو وڵاتە یەك لە دوا یەك لە وڵاتی چین ڕێگریـەکی زۆر بـەهێز کـراوە لـەوەی کەدەنگی موسڵمانان لەوڵاتەکەیان بچێتە دەرەوە.

سەرەڕای ئەوەی کە توشی ئازارو ناڕەحەتییەکی زۆر بوون بە هۆی پاکتاوی ڕەگەزی و کۆچ پێ کردنیان یاخود هێنانی خەڵکی چینی بۆ ناوچەکەیان تا ژمارەیان کەم بێتەوە یاخود بەو هۆیەوە لاواز بکرێن و بتوێنەوە لە زەمینی چین دا. حکومەتی پەکین دوو ساڵ بەر لە ئێستا نزیکەی سەد هەزار کچی شوو نەکردوی لە موسڵمانە ئیغورەکان برد کە تەمەنیان لە نێوان(١٥-٢٥)ساڵ دا بوو بە بێ پرسی خاوەنەکانیان دابەشیان کردن بەسەر چەند ناوچەیەك لە دەرەوەی هەرێمەکەی خۆیان و تا ئێستا کەس و کاریان هیچ هەواڵێك نی یە لە بارەیانەوە. هەر چەندە حکومەتی پەکین لافی شیوعیەت لێ ئەدات و ئەیەوێت چینایەتی نەهێڵێ و مافی بەش خوراوی کرێکار دابین بکات زۆر جار بە دوو مانگ جارێك پارەی کرێکارە ئیغور ییەکان نادات یاخود ناهێڵێت سودمەند بن لەو یەکانەی لەلایەن کارگەکانەوە بنیات ئەنرێت بۆ کرێکاری کارگەکان. کارەساتی موسڵمانە ئیغۆرییەکان کارەساتێکی پڕ ئازارو پڕ لە ناڕەحەتییە ئەویش لەبەر چەند خاڵێك یەکێك لەوانە ئەمان کەوتونەتە داوی وڵاتێکی زۆر گەورەو فراوان و بەهێز لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان و زۆری خاکەکەی وە تا ئێستا حکومەتی پەکین توشی هیچ لێك ترازانێك نەبووە وەکو حکومەتی یەکێتی سۆڤیەت ئەمە جگە لە پێگە بەهێزە ئابوری یەکەی ، بۆیە کێشەی موسڵمانانی چین لەبەر بێ خاوەنیان و هەتیوی ئیسلام کەس ئاگاداری ناڕەحەتی یەکانیان نی یە نەوەك کێشەی تبتی یەکان یان وەك کێشەی کاسۆلیکەکانی وڵاتی ئەندەنوسیا خێرا وڵاتە زلهێزەکان چوون بەهانایانەوەو حکومەتی سەربەخۆیان بۆ دروست کردن، موسڵمانانی چین لەناوچەیەك جێگیرن

کە بەناوی تورکمانستانی ڕۆژهەڵات ناسراوە بە چینی پێ ی ئەوترێت شنغیانغ–واتا (سنوری تازە).

## تورکمانستانی ڕۆژهەڵات یان هەرێمی شینغیانغ

لە ڕووی هەڵکەوتووی جوگرافی یەوە ئەکەوێتە ئەو پەڕی خۆرئاوای چینەوە لەباشوری ڕۆژهەڵاتیەوە هەرێمی کینغای و هەرێمی غانسوو وە لە ڕۆژهەڵاتەوە مەنگۆلیاوە لە باکورەوە ڕوسیاو لە خۆرئاواوە کازاخستان و قیرغیزستان و تاجیکستان و ئەفغانستان و پاکستان و بەشێك لە هەرێمی کشمیری ژێر دەسەڵاتی هیندستان، پایتەختی هەرێمەکەی ئۆرومشی یە و ڕوبەرەکەی (١٠٦٢٦,٠٠٠)کلم چوارگۆشەیە، گەورەترین هەرێمی چینی یە کە حوکمی زاتی هەبێ وە شەشەم هەرێمی گەورەیە لەچین و ڕوبەری (٥٤٠٠)کلم چوارگۆشەی خراوەتە سەر هەرێمی کینغای و غانسو.

# ئیغۆرییەکان

زمــان و ڕۆشــنبیریان زۆر نزیکــه لــه ئۆزبەکیەکان،بــەڵام ئیغۆریــەکانی تورکمانــسان پیتــی تایبــەتیان بــە خۆیــان دانــاوەو خۆشــیان لەســەری ڕاهێنــاوە گــەلێکی جێگیرو خــاوەن نیــشتمانن و نــەوەك کۆچــەری زیــاتر ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ کردن و بازرگانی کردنه.

ئیغۆری یەکان لە خۆرئاوای وڵاتی چین ئەژین (شینغیانغ)یان ئەوەی پـێ ی ئـەوترێ تورکمانـستانی ڕۆژهـەڵات پایتەختەکـەیان تازەمـەنێکی نزیکی بەر لە ئێستا ناوی (کاشغەر)بوو لـەوو هەرێمـە نزیکـەی هەشت ملیۆن موسڵمانی ئیغۆری لێ یە لەگەڵ نزیکەی ملیۆنێك لە کەمایەتی یە موسڵمانەکانی ئاسیای ناوەڕاست کەزۆربەیان لە خەڵکی تاجیکستان و کازاخــستان و ئیغۆریــەکان زۆر بــەی کــات لــەدەرەوەی دەســەڵاتی ئیمپراتــۆری چــین بــوون و زۆر تــر پەیوەنــدی ڕۆشــنبیری یــان لەگــەڵ موسڵمانانی ئاسیای ناوەڕاست بەهێز تر بوو تا پەکین! .ئیغۆری یەکان نەکەوتنەپــەلاماری داگــیر کــاری چــینی هــەتا ناوەڕاســتی ســەدەی هــەژدە.هــەتا ئــەو کاتــە هــەر بەدەســت کاربەدەســتانی نــاو خــۆوە بوون،چونکە لاریـان نـەبوو لـە پێدانی باج لەسـەر پـەیمانی ئیمپراتـۆر بــوون ، ژمــارەی دانیــشتوانی هــەرێمی شــینغیانغ بــە پێــی ســەرژمێری حکومــەتی چــین نزیکــەی ٢١ ملیۆنــە لــەو ژمــارە ١١ ملیۆنیــان لــە موسـڵمانانی ئیغـورە لەگـەڵ هەنـدێ کەمەنەتـەوەی تـر وەکـو هـۆزی- کــازاغی-تەتــەر-ئۆزبــەکی-تــا جیکی و بــە پێــی ئامــارە ڕەسمیــەکان ڕەگەزی هان زیاد ئەکات کە ئەوان بالآترین ڕەگەزن لە وڵاتی چین دا کە ژمارەیان ئەگاتە نەوەت ملیۆن کەس،ئەم ڕێژەیە نزیکەی ٤٠٪ ئەکات وە

له‌ناوه‌ڕاستی سه‌ده‌ی ڕابردوو ڕه‌گه‌زی هان ته‌نها ١٠٪ پێکئه‌هێنا، خه‌ڵکی ئه‌م هه‌رێمه‌ به‌ چه‌ند شێوه‌زارێکی جیا جیا قسه‌ ئه‌که‌ن وه‌ك توركی كازاخی –مه‌نگۆلی و ساریكولی–واكیهی كه‌ ئه‌م دوو شێوه‌ زاره‌ زۆر له‌ زمانی فارسی و زمانی ئۆدردۆی ئه‌چێت.له‌وڵاتی چین ڕه‌گه‌زی هان گه‌وره‌ترین و به‌رباڵوترین ڕه‌گه‌زن و ژماره‌ی دانیشتوانیان له‌سه‌دا ٩٠٪ دانیشتوان چین پێك دێنن سه‌ده‌یه‌ك به‌ر له‌ زاین كاتێك ئیمپراتۆری چینی هان هاته‌ سه‌ر ده‌سه‌ڵات،ئه‌م ناوه‌ بڕا به‌سه‌ریاندا ڕه‌گه‌زی هان به‌جیهاندا بڵاوبونه‌ته‌وه‌ نزیكه‌ی ١٢٠ملیۆنیان له‌ باشوری ڕۆژهه‌ڵاتی ئاسیاو ئه‌مه‌ریكای باشور ئه‌ژین، له‌ ولاتی سه‌نگافوره‌ له‌ ٧٧٪ دانیشتوان پێك دێنن و له‌سه‌دا ٥٪ هه‌ر یه‌كه‌ له‌ ئه‌نده‌نوسیاو تایلاندو فلیپین و ڤێتنام و میانمار پێكدێنن.هه‌روه‌ها ١٠٢ ملیۆن له‌ هانه‌كان له‌كه‌ندا ئه‌ژین و ٢٠٤ ملیۆن له‌ وڵاته‌ یه‌ككرتوه‌كانی ئه‌مه‌ریكا جگه‌ له‌وه‌ی له‌ ڕوسیاو فه‌ڕه‌نسا و به‌ریتانیا ئوستالیاو باشوری ئه‌فه‌ریقادا هه‌ن.

له‌ڕووی ئاین و ڕۆشنبیریه‌وه‌: زۆربه‌ی هانه‌كان له‌سه‌ر بیروباوه‌ڕی كونفشیوسی و گاویه‌و بوزین، هه‌روه‌ها هانه‌كان به‌حه‌وت زمانی ناوخۆی قسه‌ ئه‌كه‌ن و به‌ شێوه‌زاری چینی كۆنیش قسه‌ ئه‌كه‌ن و ئه‌ژدیهاش به‌كاردێنن وه‌ك ڕه‌مزێك بۆ خۆیان،هانه‌كان ڕۆڵێكی زۆر خراپ ئه‌بینن بۆ كه‌مكردنه‌وه‌ی ژماره‌ی دانیشتوانی ناوچه‌ موسڵماننشینه‌كانی توركمانستانی ڕۆژهه‌ڵات و هه‌رچی ده‌سه‌ڵات دارو خاوه‌ن بڕیار به‌ده‌سته‌ له‌ وڵاتی چین ڕه‌گه‌زی هانه‌ . هه‌ر چه‌نده‌ موسڵمانه‌ ئیغۆرییه‌كان چه‌ند شۆڕشێكیان به‌رپا كرد له‌ دژی حكومه‌تی په‌كین وه‌ له‌سه‌ده‌ی بیست دا دوو ده‌وڵه‌تیان هه‌بوو،به‌ڵام

تەمەنی دوو دەوڵەتەکە کورت بوو دەوڵەتی دووەمی کۆتایان هەتا ساڵی ١٩٤٥ بڕی کرد ئیغۆر وەکو هەموو خەڵکی چین زەرەر مەند بوون لە شۆڕشی بەناو ڕۆشنبیری،چونکە کە شۆڕش هەڵگیرسا لەسەر دەستی ماو هەرچی پەرستگاو مزگەوت هەبوو هی موسڵمان و مەسیحی و بوزی....هتد لەوڵاتی چین هەمووی ڕوخێنرا،بەڵام دوای مردنی (ماو) جارێکی تر حکومەتی پەکین ڕێگەی دا بە ئازادی دینی و پەرستش،بەڵام بەشێوەیەکی سنوردار،چونکە حکومەتی پەکین لە ژێر دەسەڵاتی شیوعی دا ئاین بە هەڕەشە ئەزانیت بۆ سەر وڵات، بەڵام نزیکەی ١٠ ساڵ ئەبێت حکومەتی پەکین کەوتۆتە پلان بۆ توانەوەی ئیغۆر بەوەی هانی ڕەگەزی هان ئەدات بێنە سەر خاکی ئیغۆرو خەریکی کشتوکاڵ و دروست کردنی شاری تازەو دروست کردنی کارگەی گەورەن لەسەر خاکی ئیغۆر،ئەمەش باشترین دەرفەتە بۆ ئەوەی ڕێژەی موسڵمانانەکان بتوێنێتەوە لە بەحری چین داو موسڵمانەکان لەناو هەرێمەکەی خۆیان کە زۆرینەن بکرێن بە کەمینە کە ئێستا ڕێژەی ٥٠٪ دانیشتوان پێکدێنن ساڵ لە دوای ساڵ ئەم ڕێژەیە دائەبەزێت جگە لەوەی حکومەتی پەکین ئەیەوێت لە ڕێگەی بەحسابی خۆی ئاوەدان کردنەوەی شینغیانغ یان گەورە کردنی ڕێژەی موسڵمانەکان بەرەبەرە بەرەو کەم بونەوە بەرێت.

ئەم خشتەیەی خوارەوە ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی شینغیانغ لە ١٩٤٩/٢٠٠٠ نیشان ئەدات:

| ساڵ/ژمارە ڕەگەز | ئیغۆر | هان | کازاخی | هوی |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٤٩ | ٪٧٥ | ٪٦,٧ | ٪١٠,٢ | ٪٢,٨ |
| ١٩٦٤ | ٪٥٤ | ٪٣٢,٨ | ٪٦,٧ | ٪٣,٦ |
| ١٩٨٢ | ٪٤٥,٤ | ٪٤٠,٤ | ٪٦,٩ | ٪٤,٣ |
| ١٩٩٠ | ٪٤٧,٤ | ٪٣٧,٥ | ٪٧,٤ | ٪٤,٥ |
| ٢٠٠٠ | ٪٤٦ | ٪٣٩,٢ | ٪٧,١ | ٪٤,٥ |

حکومەتی پەکین ترسێکی زۆر گەورەی هەیە لەو بزووتنەوانەی کە داوای سەربەخۆی ئەکەن بۆ هەرێمەکەیان و بۆیە زۆر بەتوندی گوشاری خستوەتە سەریان تەنیا یەك خوێندنگە هەیە لە شینغیانغ بۆ نزیکەی هەشت ملیۆن موسڵمان و چاودێریکی زۆر توندی لەسەر مزگەوت و ئیمامی مزگەوتەکان داناوە.

ئیمامی مزگەوتەکان لە پیاوانی سیخوڕ ئەترسن وە لە سەر دیواری مزگەوتەکان حکومەت لافیتەی هەڵواسیوە بۆ ئەوەی هەر کەس تەمەنی لە ١٨ ساڵ کەمتر بێت نابێت بچێت بۆ مزگەوت و ناهێڵێت تەنانەت لە ماڵەکانیش دا منداڵەکانیان فێری ئادابی ئیسلامی بکەن.

بە هیچ جۆرێك ناهێڵن موسوڵمانانی ئیغۆر پاسپۆرتتیان هەبێت و سەردانی وڵاتانی دەرەوە بکەن لە ترسی ئەوەی نەك هێڵی پەیوەندی ببەستن لەگەڵ ئەو گروپانەی کە بە حسابی پەکین تیرۆریستن یان ئەو خەڵکەی کە بە ڕەچەڵەك ئیغۆری یەو ئێستا لە مەنفا ئەژین،وە بۆیان

نیە لە فەرمانگەکانی حکومەت دابمەزرێن بە بیانووی ئەوەی ئەمان زمانی چینی باش نازانن.

زۆر جار ئاستەنگیان بۆ دروست ئەکەن بۆ ئەوەی فێری زمانی ئینگلیزی بن بۆیە ئێستا وەك هاوڵاتی پلە دوو سەیر ئەکرێن. موسڵمانانی ئیغۆر هەمیشە نارەحەتن لەوەی کە حکومەتی چین بەبێ ڕشتنی خوێن خەریکە لەناویان ئەبات،بۆیە زۆر جار لێرەو لەوێ لەگەڵ پۆلیس و پیاوانی حکومەت پێکدادان دروست ئەبێت، حکومەتی پەکین هەوڵی جدی داوە کە بە هەموو شێوەیەك تا هیچ هاوکاری یەك نەگات بە موسڵمانانی چین لەلایەن ئەو برایانەوە کە لە مەنفا ئەژین وە زۆر جار حکومەتی پەکین داوا لە ولاتان ئەکات کادیرە سیاسییە چالاکەکان کە لە ولاتە دراوسێکان ئەژین تەسلیم بە پەکین بکاتەوە و لەبەرامبەر دا حکومەتی پەکین هەوڵی کرانەوەی بازاڕی ئابوری ئەدات لەگەڵ ئەو ولاتانەدا بە کورتی ئەو کێشەیەی کە ڕوبەڕوی موسڵمانان بوەتەوە لە وڵاتی چین ئاسۆیەکی ڕوونی نی یە بەتایبەت دوای ١١ سێپتەمبەر کاتێك ئەمەریکا و نەتەوە یەکگرتوەکان بزووتنەوە ئیسلامی یەکانی تورکمانستانی ڕۆژهەڵاتی خستە ناو بازنەی ئەو گروپانەی کە پەیوەند یان لەگەڵ ڕێکخراوی قاعیدە هەیە ئەمەش زیاتر دەستی حکومەتی پەکین ی کردەوە بۆ لێدان لە موسڵمانانی ئەو هەرێمە موسڵمانانی چین کێشەیەکی دورو درێژ یان هەیە بەڵام بەداخەوە تا ئێستا کەم تازۆر لەبارەیانەوە نەزانراوەو ئەو کارەساتانەی بەسەریاندا هاتووە کەم کەس لێ ی بە ئاگایە.

## ڕیزبەندی گرنگترین ئەو ڕوداو وکارەساتانەی کە لەهەرێمی شینغیانغ ڕویداوە

لە تشرینی دووەم ساڵیَ ١٨٨٤ز چینەکان تورکمانستانی ڕۆژهەڵاتیان داگیر کرد خستیانە سەر ولاتی چینی و ناوەکەیان گۆڕی بۆ شینغیانغ کە بەمانای (سنوری تازە)دێت.لەساڵیَ (١٩١١) دوای ڕوخانی ئیمپراتۆری چینی سەرکردە سەرباز یەکان دەستیان گرت بەسەر هەرێمی شینغیانغ وهەمان سیاسەتی چەوسانەوەیان گرتە بەر بەرامبەر ئیغۆر.

لەساڵی (١٩٣١)شۆڕشی ئیغۆر دەستی پێکرد لە ڕۆژهەڵاتی هەرێمەکە بە سەرکردایەتی (خوجە نیازو یولبارخان)بوو بەهۆکاری داگیر کاری زەوی یە کشتوکاڵی یەکانی جوتیارە ئیغۆر یەکان ئەم زەویانە ئەدرا بە ڕەگەزی هان . لە تشرینی دووەمی ساڵیَ (١٩٣٣) کۆماری تورکمانستانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دامەزرا بە چەند سەرکردەیەکی جیاواز ئیغوار چووە ناو کۆمارەکەوە.

لە ٦ی شوباگ ساڵی ١٩٣٤ کۆماری تورکمانستان ڕوخێنرا لەسەر دەستی سەرکردەی شۆڕش (شونغ ینغ) بەهاوکاری یەکێتی سۆڤیەتی جاران.

لە ١٢ تشرینی دووەم ١٩٤٤ شۆڕش گێڕە ئیغۆری و کازاخییەکان دەوڵەتی تورکمانستانی ڕۆژهەڵاتیان ڕاگەیاند کە هەر سیَ هەرێمەکەی

باکوری ئەگرێتەوە بەسەرکردایەتی مەرجەعی دینی ئۆزبەگی علی خان توری.
لە ئابی١٩٤٩ بەهۆی ڕوداوێکی پڕ لە تەم و مژاوی لەسەر ئاسمانی مەنگولیا هەندێ لەسەرکردەکانی ئیغۆر لە فڕۆکەدا کەوتنە خوارەوەو مردن کە ئەمانە بوون (احمد جان قاسمی و عبدالکریم عباس و دلیل خان و اسحاق باغ) کە دەستی هەریەکە لە یەکێتی سۆڤیەت و چینی تێدا بوو دوای ئەم ڕوداوە جارێکی تر حکومەتی چین هەرێمەکەی داگیر کردەوە ، لە ئایاری ١٩٥٤ ئیغۆری یەکان لیژنەیەکیان پێك هێنا بۆ جیهاد کردن لە پێناو دروست کردنی حکومەتێکی ئیسلامی تا کاروباری هەرێمەکە ببات بەڕێوە.لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٥ حکومەتی چین ڕایگەیاند کە هەرێمی شنغیانغ هەرێمێکی چینی، بەلام بەحوکمی زاتی،بەلام ئەم حوکمی زاتیە تەنیا حکومەتێکی کارتۆنی بوو، لەساڵی ١٩٦٢- بەهەزارەها لە ئیغۆرو کازاخییەکان ولاتیان بەرەو باکوری هەرێم جێهێشت بەرەو یەکێتی سۆڤیەت دوای ئاڵۆزبونی پەیوەندیِ موسکۆ و پەکین.
لە ساڵی ١٩٦٤ چین یەکەم تاقیکردنەوەی نەتۆمی ئەنجامدا لە ئاسمانی هەرێمی شینغیانغ.لەساڵی ١٩٦٦ حزبی شیوعی چینی هەستا بەدەستگیری موسڵمانانی ئیغۆرو ڕێگری پەرستشی لێکردن ومزگەوتەکانی ڕوخان و قەبرستانەکانی تێکدان و موسڵمانانی ناچار کرد تا بەراز بەخێو بکەن .
لە شوباتی ساڵی ١٩٦٨ حیزبی گەلی شۆڕشگێڕی تورکمانستانی ڕۆژهەلات (ڕێکخستنی نهێنی)دامەزراند کە کۆمەڵێکی لە ڕۆشنبیرو بژاردەو گەنجانی ئیغۆر و بەشێك لە کەمە نەتەوایەتیەکانی تر

دایانمەزراند.لەساڵی (١٩٦٩)حکومەتی چین دەستی کرد بەگرتنی هەموو سەرکردە دیارەکانی هەڵگەڕانەوە سەرنەکەوتوەکە.
لە ١٢ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٨ خۆ پیشاندان خوێندکاران کە سەرانسەری هەرێمەکەی گرتەوە داوای مافی ڕۆشنبیری بۆ گەلی ئیغۆریان دەکرد.
لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٨٨) خوێندکارانی ئیغۆر سەر لە نوێ خۆپیشاندانیان کرد دژی جیا کاری ڕەگەزی کاتێك خوێندکاران ڕەفزی ئەوەیان کرد لەگەڵ خوێندکارە ئیغۆریەکان تێکەڵ بکرێت.
لە ٢٥ی شوباتی ساڵی ١٩٩٧ یەکێتی لە پێناو یەکپارچەیی تورکمانستانی ڕۆژهەلات هەستا بە هێرش کردنە سەر گرنگترین ڕێگاکانی ئۆتۆمبیلی بارهەڵگر بە نارنجۆك لە پایتەخت لە ئۆرموشی نۆ کوژراوو ٧٩ برینداری لێ کەوتەوە.
لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٧ لە هەرێمەکەدا خۆپیشاندان کرا بۆ داوا کردنی ئازادی پیادە کردنی سرووتە دینیەکان لەسەرتای مانگی ڕەمەزاندا لە شاری(یەنیغ) دواتر پۆلیس و سوپا بەرەنگاری خۆپیشاندانەکە بوونەوە بەدەیان کوژراو وبەسەدان برینداری لێ کەوتەوە ، لە کانونی دووەم- تا ئازاری ١٩٩٩ حکومەتی چینی بەهەموو جۆرێك زۆر بەتوندی بەرپەرچی هەموو ناڕەزاییەکی ئەدایەوە.
لە نیسانی ٢٠٠١ حکومەتی چینی دەستی کرد بە بەکارهێنانەوەی توندوتیژی دژی ئیغۆریەکان و بەهەزارەها کادریی زۆر چالاکی لێ دەستگیر کردن.

له ئابی ۲۰۰۲ وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو نەتەوە یەکگرتووەکان بزووتنەوە ئیسلامییەکانی تورکمانستانی ڕۆژهەڵاتی خستە ڕیزبەندی ئەو گروپانەی کە پەیوەندیان بە ڕێکخراوی قاعیدەوە هەیە.

له تەموزی ۲۰۰۹ لە ئۆرومشی پێکدا هەڵبژان ڕویدا بەهۆی داواکاری بەلێکۆڵینەوە لەو شەڕەی کەڕوویدابوو لە نێوان ئیغۆرو هان لەکارگەی یاری منداڵان و دواتر پەرەیسەند بۆ شەڕو ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ پۆلیس و دەیان کوژراوو بەسەدان بریندراری لێ کەوتەوە.

تێبینی / ئیغۆر، بەمانای چەند هۆزێکی یەکگرتوو یان هاوپەیمان دێت.

# ئازاری موسڵمانان لە مەنگۆلیا

مـەنگۆلیا ئەکەوێتـە ناوەنـدی ڕۆژهـەڵاتی کیـشوەری ئاسـیاو لـەنێوان هەردوو وڵاتی ڕووسیاوچین دایە
پایتەخت : ئۆلان باتوور
ڕۆژی سەربەخۆیی: ١١-یۆلیۆی- ١٩٢١
ژمارەی دانیشتوان :٢٧٩١٣٠٠ کەسە
ڕووبەری خاکەکەی : ١٥٦٥٠٠٠ کیلۆمەترە
بووزی : لە٩٠٪ .
مەسیحی :لە٨٪ .
موسڵمان :لە٢ ٪ .

## گەیشتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە مەنگۆلیا

باری موسڵمانان لەسەردەمی شیوعیەکان دا
ئاینی ئیسلام بـە شێوەیەکی بەرچاو لـە وڵاتـی مـەنگۆلیا بڵاوبوویـەوە وقازاقی یەکان کەلە هۆزی قان بوون لەکاری بانگخوازی دا زۆر چالاك بوون،بەڵام بەهاتنە سـەر حوکمی شیوعییەکان باری موسڵمانان تـەواو گۆڕا شیوعییەکان بەهەموو شێوەیەك دژایەتی ئاینی ئیسلامیان ئەکرد بۆ وێنە لە ساڵی ١٤١١ کۆچی ٤٠٠ خێزانی موسڵمان ناچار کران بچنە سەر دینیی بوزیـەکان. زۆرێك لەموسڵمانان ناچار بوون کـۆچ بکەن تـا

بتوانن دەست بە ئاینەکەیانەوە بگرن.لە ساڵی ١٩٢٦ حەوت کەس چوون بۆ زیارەتی ماڵی خوا تەنهایە کەسێ کیان گەڕایەوە بەناوی ئەبوبەکر حاجی.

له ساڵی ١٩٢٨ کۆمەڵێك کەس ویستیان بچن بۆ حەج بەڵام ڕێگەیان پێ نەدرا تا ساڵی ١٩٩٠،لەساڵی ١٩٣٧-١٩٣٩ لە دوو خۆپیشاندانی موسڵمانەکان ٣٢٧٠ کەس یان لێ کوشتن کە زۆربەیان مەلا و بانگخواز بوون و دوای خۆپیشاندنەکە حکومەت دەستی کرد بە سوتانی کتێبی ئیسلامی قورئان و ڕووخاندنی مزکەوت.لە ساڵی ١٩٣٠ لەهەموو مەنگولیا تەنها پانزە مزگەوت مابوو.

لەساڵی ١٩٣٦-١٩٤٠ تەنها یەك مزگەوت بەکراوەیی مابۆوە ئەویش لە شاری ئۆلغای بوو. لەماوەی حوکمی شیوعییەکان لە مەنگولیا لە کۆی ١٢٧٦ ئیمام چەند دانەیەکی کەمیان مایەوە لە ژیاندا باقیەکەی تری لەلایەن دەسەڵاتی شیوعییەکانەوە کوژران و لەناوبران.

لەماوەی ٧٠ ساڵی حوکمی ششیوعییەکان دا بەهەموو جۆرێك خوێن و ماڵ موڵکی موسڵمانان حەڵاڵ بوو،بەهەموو جۆرێك لێ یان کوژاوەو دەستگیراوە بەسەر ماڵ و سەرەوەت و سامانەکەیاندا.جگە لەوە حکومەتی شیوعی یەکان لەڕێگەی خواردنی دروستکراو لە گۆشتی بەراز و عارەق و شەرابەوە خەریکی لەناو بردنی ئەم گەلە موسڵمانە بووە.

# ئازاری موسڵمانان لە تایلاند:

**سەرەتایەك بۆ ناسینی تایلاند**

تایلاند ئەکەوێتە باشوری ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئاسیاو دەورە دراوە بەم وڵاتانە: لە باکورەوە لاوس و میانمارو لەڕۆژهەڵاتەوە لاوس و کەمبۆدیا و لە باشورەوە مالیزیاو کەنداوی تایلاند و لەرۆژئاواوە میانمارو دەریای ئەندامان.

ژمارەی دانیشتوان : ٦٣ ملیۆن کەسە

زمانی ڕەسمی وڵات : زمانی تایلاندیی یە

دراو : بات

پایتەخت: بانکۆك

ئاینی زۆربەی دانیشتوانی تایلاند : بووزی یە

موسڵمان لە وڵاتی تایلاند بە گشتی کەمینەن،بەڵام لە ناوچەی فەتانی زۆرینەی دانیشتوانی موسڵمانن.ڕووبەری خاکەکەی (٥١٣) هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە ناوچەی موسڵمانانی تایلاند.

فەتانی ئەو ناوچەیەیە کە ئەکەوێتە نێوان مالیزیاو تایلاند. موسڵمانانی تایلاند لەم ناوچەیە نیشتەجێن و ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە هۆی بازرگانە موسڵمانەکانەوە لە سەدەی پێنجەمی کۆچی هاتۆتە ئەم ناوچەیەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ موسڵمانان لە زیاد کردن دا بوون تا سەدەی

هەشتەمی کۆچی تەواوی ئەم ناوچەیە موسڵمان بوون و کاری یان بە قورئانی پیرۆزئە کرد.

هەتا ئێستاش موسڵمانانی ئەم ناوچەیە دەستیان بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە گرتووە و بەپیتی عەرەبی ئەنوسن.

ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی داگیرکاریی:

تایلاندییەکان زۆرجار هێرشیان کردۆتە سەر خاکی فەتانی تا داگیری بکەن.

یەکەم هیرشیان لە ساڵی ١٧٨٦زاینی توانییان دەست بگرن بەسەر بەشێك لەخاکی فەتانی داو بەشێك لەقەڵاکانی فەتانی بڕوخێنن و خەڵکانێکی زۆریان بەدیلی گرت و ناچاریان کردن بە پێ بڕۆن بە ماوەی ١٣٠٠ کیلۆمەتر. حکومەتی تایلاند زۆر دڕاندانە مامەڵەی لە گەڵ دیلەکاندا کرد زۆریانی لە هەندێك ئیشی زۆر قورس دا بەکار هێنا وەکو هەڵکەندنی جۆگەی گەورەی ئاودێری.لە ساڵی ١٨٣٢ و جارێکی تر خاکی فەتانی داگیر کرایەوە. لە ساڵی ١٩٠٢ توانیان کۆتا حاکمی فەتانی(تنکۆ عبدالقادر قەمەردین )دەستگیربکەن وکۆتایی بە سەر بە خۆی فەتانی بێنن.

کاتێك خاچ پەرستە پورتوگالی یەکان تایلاند هێرشیان کردە سەر ناوچەی موسڵمان نشینی فەتانی و داگیریان کرد لە ساڵی ٩١٧ کۆچی،بەلأم بەهۆی بەرگری موسڵمانەکانەوە نەیانتوانی زۆر بمێنەوە زوو خاکی فەتانییان بەجێهێشت.

لەگەڵ داگیرکاری ئیگلیزەکان بەرەو کیشوەری ئاسیا وڵاتی تایلاند کەوتە بەر پەلاماری ئینگلیزەکان و لە ساڵی ١٩٠٢ خاکی فەتانییان داگیر کرد هەرچەند موسڵمانانی ئەو ناوچەیە زۆر بە توندیەوە

بەرپەرچـی داگـیر کـاری یەکـەیان دایـەوە و دەسـتیبیان لـە خـەبات هەڵنەگرت بۆ ڕزگار کردنی ناوچەکەیان،بەڵام بەهۆی ئەم داگیرکار یەوە خاکی فەتانی بە تەواوەتی خرایە سەر خاکی تایلاندو ئەم کارەش بـوو بە هۆکاری گرژی و ئاڵۆزی لـە نێوان موسڵمانان و بوزیـەکان. کاتێك حکومەت گۆڕا و لـە پاشایەتی یـەوە بوو بە کۆماری بەهۆی کودەتـای سەربازی یەوە لە ساڵی ١٩٣٣،موسڵمانانی تایلاند لەو چوار ناوچـەی کە زۆرێنە پێك دێنن( فەتانی .جالا . ساتوول. بنغارا) داوای مافـەکانی خۆیـان کـردەوە کـە سـالأنێك بـوو لێیـان زەووت کـرا بوو،بـەڵام حـاڵی موسـڵمانان تـەواو بـەرەو خراپـی چـوو لـە دوای ئـەو گۆڕانکـاری یـەوە حوکەتی سەربازی (سەنقرا) کەوتە دژایەتی موسڵمانان  یەکەم هـەنگاو بـە گـۆڕینی نـاوە ئیـسلامییەکاندەستی پـیٚ کـردو دەسـتی کـرد بـە داخـستنی مزگـەوت و قوتابخانـە ئیـسلامییەکانو پۆشـاکی سـپی کـە پیاوان لە بەریان ئەکرد قەدەغە کرا و نەیانهێشت ئافرەتـان پۆشـاکی ئیـسلامی بپۆشـن و ڕێگـری لـە بانگـەوازی ئیـسلامی کـراو دەرگـای بـۆ بوزیـەکان خـستە سـەر پـشت تـا بانگـەوازی خۆیـان بکـەن جگـە لـە سیاسەتی کۆچ پیٚ کردنی بە زۆر تا ڕێـژەی موسـڵمانان لـەو ناوچانەی زۆرینەن کەم بکانـەوە و ئەوانـەی بـووزین بە زۆر ئەیهێنانـە سـەر خـاکی موسڵمانان.

### هۆکارەکانی سەرکوتکردنی موسڵمانان له تایلاند

خـاکی فـەتانی موسڵمانـشین بـەپیتترین خـاك دا ئەنرێـت لـە تایلانـد بـۆ کشتوکاڵ کردن،بەم هۆیەوە حکومەتی بووزی تایلانـد دەسـتی بـە سـەر زۆربـەی ناوچـەکانی ئـەم هەرێمـەدا گـرت هۆکـاری گەشـتو گـوزاری ناوچـەی فـەتانی یەکێکـە لـە ناوچـە سـەرنج ڕاکـێش و دڵڕفێنـەکانی

تایلاند،به تایبەت ئەو بەشەی هاو سنووره له گەڵ مالیزیا دا گەشتیاره بیانی یەکان ڕوو ئەکەنە ئەم ناوچەیە ئەمەش ئەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگی داهات بۆ حکومەتی بانکۆك.
ئەمە جگە لەوەی ناوچەی موسڵمانەکان دەوڵەمەندە بە سامانی سروشتی ئەم هۆکارەش پاڵی بە حکومەتی تایلاندەوە ناوە تا بە زۆر موسڵمانان دەربکات و خەڵکی بوزی بهێنێتەناوچەی موسڵمانەکانەوە هەروەها سود له بووز یەکان وەر ئەگرێت لەم ناوچانە کە وەکو سیخوڕ بە کاریان دێنێت دژی موجاهیدانی فەتانی و لە کاتی شەڕو ڕووبەڕوونەوەکان وەکو سەربازی دژی موسڵمانەکان بە کاریان دێنێت .هەروەها به دزینی سەروەت و سامانی ناوچەی موسڵمانان حکومەتی بانکۆك توانیویەتی موسڵمانانی ئەو ناوچانە دەست بەتاڵ و هەژارییان بکات تا توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی حکومەتییان نەمێنێت. ئێستا حکومەتی بانکۆك خەریکی بڵاوکردنەوە ڕۆشنبیری بووزییە له ناوچەی موسڵمانان.
له بواری خوێندن: حکومەتی بانکۆك دەستی کردوە بە سیاسەتی گۆڕینی زمانی خۆێندن له خوێندگە ئیسلامییەکانله مەلاوی یەوە بۆ زمانی سیامی و بە هیچ جۆرێك ناهێڵێت کتێبی فێرکاری بگاتە دەست موسڵمانان تا فێری قورئان بن یاخوود فێری ڕۆشنبیری ئیسلامی بن.لە ساڵی ٢٠٠١ وە حکومەتی بانکۆك چاودێریەکی توندی خستۆتە سەر خوێندنگا ئیسلامی تایبەتەکان بەبیانووی ئەوەی ئەم خوێندنگانە قوتابی یەکانی ئەبن بە چەکداری لایەنە ئیسلامی یەکان.

## شۆڕش لە پێناو ئازادی

بەهۆی ئەو زوڵم وزۆرەی حکومەتی بانکۆك ئەیکرد بەرامبەر گەلی موسڵمانی تایلاند لە ناوچەی فەتانی. موسڵمانان بۆ بە دەست هێنانەوەی مافی زەوتکراوی خۆیان دەستیان دایە چەك تا لە ڕێگەی جیهادەوە مافی زەوت کراوی خۆیان بەدەست بێنەوە.حکومەتی بانکۆك بەئاگرو ئاسن کەوتە گیانی گەلی ستەم دیدەو بە هەموو جۆرێك سەرکوتی دەنگی کپکراوی موسڵمانان دەکات. یەکەم خۆپیشاندانی موسڵمانان لە گەڵ پولیس لەڕیزی موسڵمانان ٦٠کوژراوی لێ کەوتەوە. لە ٢٨ – یەنایەری – ٢٠٠٤ شەڕو پێکدادان ڕووی دا لە نێوان هێزی چەکداری موسڵمانان( بزووتنەوەی ڕزگاری فەتانی یەکگرتوو " بۆلۆ" ) وسوپای حکومەت ١٠٨ کەس کوژرا لە چەکدارە ئیسلامییەکانلەم شەڕەدا حکومەت ئەوپەڕی توند و تیژی بەکار هێنا بەرامبەر بە موسڵمانان بە جۆرێك ٣٠ گەنجی موسڵمان پەنایان بردە بەر مزگەوتێك کەچی هێزە چەکدارەکانی حکومەت مزگەوتەکەیان ڕووخاند بەسەر ئەو گەنجانەدا.

موسڵمانانی فەتانی خۆپیشاندانێکی هێمنانەیان سازدا بە مەبەستی ئازاد کردنی (٧٠) بەندکراو هێزەکانی حکومەت زۆر بە توندی ڕوبەڕوی خۆپیشاندەران بوویەوە ٨٠ کەسی لێ کوشتن و ١٠٠٠ کەسی لێ بریندار کردن و بەندی کردن.

دڵۆپێك لە ئازاری موسڵمانان

١- لـە دوای داگـیر کردنـی خـاکی فـەتانی و لکانـدنی بـە وڵا تـی تایلانـدەوە و لابردنـی کۆتـا حـاکمی موسـڵمان (تنکۆعبـدالقادر) حکومـەتی بـانکۆك فـەرزی کـرد لـە سـەر موسـڵمانان کـە پۆشـاکی بوزییـەکان بپۆشـن و نـاوی منـداڵی موسـڵمانەکان بگـۆڕن بـۆ نـاوە بوزییەکان و زمانی تایلاندی کرا بە زمـانی فـەرمی بۆیـان نـە بـوو بـە زمانی خۆیان قسە بکەن.

٢- حکومـەتی بـانکۆك ٧٠ کۆمـەڵگای نیـشتەجێ بـوونی بـۆ بـوو زی یەکان دروست کرد لەسەر خاکی موسڵمانان تا ڕێژەی بوزی یـەکان زیاد بکات لە ناوچەی موسڵمانان،بەم هۆیەوە ١٨٠ هەزار بووزی لەو کۆمەڵگایانە نیشتەجێ بوون.

٣- بەهـەموو جۆرێك دژی خوێندنگـە ئیسلامییەکانوەستایەوە بـەناوی چاکسازی لـە پڕۆگرامـی خوێنـدا دەسـتکاری پڕۆگرامـی خوێنـدنی کردتـا ئاسـتی خوێنـدنی ئیـسلامی لاواز بکـات و هـەمووی خـستە خزمەت سیاسەتی حوکەتی تایلاند.

٤- حکومەتی تایلاند چەند سەربازگەیەکی گەورەی لەنزیك شـاخی بـۆ دور دروست کرد کە ئەم ناوچەیە نزیکی هێزی موجاهیدانی فەتانی یـەو بـەو هۆیەشـەوە بەشـێك لـە گونـدەکانی ئـەو ناوچـەیە بوونـە سەربازگەی هێزەکانی حکومەت.

٥- حکومــەتی تایلانــد دەســتی کــرد بــە ڕاوەدونــانی بــانگخوازو مامۆسـتایانی ئـاینی وزۆرێکـی لێ کوشـتن و زۆرێکیـان ڕایـان کردبـۆ دەوڵەتی مالیزیا جگە لەوەی بە سەدەها گەنجی موسڵمانیان کوشت و دەسـتیان کـرد بـە تێکـدان و سـوتاندنی گـەڕەکی موسـڵمانان لـە یەکێك لە قێزەوترین کوشت و بڕینـی لاوانـی موسـڵمان لـە یـەکێك لـە

هەڵمەتەکانی سوپای حکومەت ١٠٠ گەنجی بەبەنزین سوتان وبەرپرسی بنکەی پۆلیسی ئەو ناوچەیە وتی نرخی گیانی موسڵمانان ٢٦ سەنتە کەنرخی یەك فیشەکە.

٦- حکومەت هەوڵی دا لە پرۆگرامی خوێند هەندێك کتێبی پڕ لە تەئویل و شوبهات دابنێت تا سەر لە نەوەی تازە پێگەشتوان بشێوێنێت لەم ڕووە وەحکومەت پشتی بە هەندێك لە شێخە قادیانی یەکان بەست.

٧- هەموو شۆڕشەکانی موسڵمانان،حکومەت بەئاگرو ئاسن سەرکوتی ئەکرد و دەستی ئەگرت بەسەر ماڵ و موڵکی موسڵمانان و گوندو شارەکانی خاپور ئەکردن،بەم هۆیەشەوە بەهەزارەها لە موسڵمانان ئاوارە بوون بۆ وڵاتی مالیزیا ئێستا لە ژێر خێمە ژیان بەسەر ئەبەن.

٨- حکومەتی تایلاند موسڵمانانی لە هەموو مافێك بێ بەش کرد هیچ لە موسڵمانەکان لە پۆستە حوکمەیەکاندا دانەمەزراون جگە لەوەی لەداهات و خێرو بێری وڵات بێ بەش کرا بوون،وەکو هاوڵاتی تایلاند سەیر نەئەکران. حکومەت سیاسەتی برسی کردن و ترساندن و بە کۆیلە کردنی بەرامبەر موسڵمانان پیادەکرد.

## پارت و ڕێکخراوە بەرگریکارە ئیسلامییەکان

١-بەرەی نیشتیمانی بۆ ڕزگاری فەتانی لە ساڵی ١٩٦٠ دامەزراوە یەکەم پارتی ڕێکخراوی ئیسلامی بوو کە داوای یەکریزی لە موسڵمانانی فەتانی کردو دەستی کرد بە خەباتی چەکداری وبە

شێوەی گروپی بچوك شەڕی چەكداری ئەكرد دژی حكومەتی بوزی داگیر كەر.
٢- ڕێكخراوی یەككگرتوو بۆ ڕزگاری فەتانی لە ساڵی ١٩٦٨ دامەزراوە.
٣-بزووتنەوەی ئیسلامی فەتانی لە ساڵی ١٩٧٥ دامەزراوە لە سەر دەستی كۆمەڵێك زانای ئاینی ئەم بزووتنەوەیە هەستا بە بڵاوكردنەوەی كۆمەڵێك ڕاگەیاندراو بۆ ناساندنی كێشەو گرفتی موسڵمانانی فەتانی و ناساندنی بە دنیای دەرەوە
ئەوەی كێشەی موسڵمانانی ناڕەحەت كردووە كێشەكەیان زۆر درێژەی كێشا بەهیچ جۆرێك حكومەتی بوزی تایلاند دان نانێت بەكێشەی موسڵمانان و بەهیچ جۆرێك ئامادە نی یە مافی زەوت كراویان بۆ بگێڕێتەوە بە هەموو جۆرێك دەنگی ئازادیخوازی موسڵمانان كپ ئەكاتەوە بە ئاگر و ئاسن ئەكەونە گیانی میللەتی ستەم دیدەی موسڵمانی فەتانی و خەریكی سیاسەتی لەنێوبردنی موسڵمانان دەستیان كردووە بە گۆڕینی ناوی گوندو شاری موسڵمانان و ڕێگری لە بالأپۆشی ئافرەتان ئەكەن و بووزی یەكان ئەهێنە سەر خاكی موسڵمانان نیشتەجێ یان ئەكەن ودەستیان كردوە بە لێدانی ئابوری موسڵمانان تا موسڵمانان هەژارو بێ كار بكەن و بەدەست هەژاری و نەداری و نەخوێندەوار یەوە بناڵێنن ڕێگری فێر بوونی ئاینی ئیسلامییان لێ ئەكەن و زمانی دایك یان لێ قەدەغە ئەكەن و لەهەوڵی بڵاو كردنەوەی ئاینی مەسیحی دان جگە لەوەی دەست لە كوشتنی موسڵمانان ناپارێزن هەرجارەو بە بیانوویەك بەسەدەها گەنج و لاویان ئەكوژن وبە زۆر تەعدا لە ئافرەتانیان ئەكەن.

## ئازاری موسڵمانان له فلیپین

### سەرەتایەك بۆ ناسینی فلیپین

فلیپین ئەکەوێتە باکوری ڕۆژهەلاتی چین و دەورە دراوە بە کۆمەڵێك دوورگە ئیستیواییەکان (الجزر الاستوائية)و بلاوبوونەتەوە لە نێوان هەردوو (زەریای هیندی )و (زەریای ئارام ) دا،بەم کۆمەڵە دورگانە ئەوترێت(دوورگەکانی هیندی ڕۆژهەلات) کە لە سەر شێوەی مانگ دەرئەکەون.

ڕووبەری فلیپین: ٣٠٠٠٠٠کم

ژمارەی دانیشتوانەکەی :٨١١٥٩٦٤٤ کەسە

پایتەختی فلیپین ناوی (مانێلایە)،بەلاَم ئەم ناوە پێش ئەوەی بیگۆڕن ناوی (أمان الله") بووە کە ناوێکی ئیسلامی یە. فلیپین لەمانێلای پایتەخت و ٤ شاری گەورەو ١٣ شارۆچکەی سەربەخۆ پێکدێت. یەکێك لە شارە گەروەکانی ناوی(کویزون) ە کە لە ساڵی ١٩٤٦ تا ١٩٧٦ پایتەختی فلیپین بووە ئەم شارە بەناو بانگە بەجوانی و ڕازاوەی و تەلارە بەرزو بڵندەکانی. شاری(کویزون) بەناوی سیاسەتمەداری فلیپین (مانویل کویزون) ناونراوە کەلە ساڵی ١٨٧٨بۆ ١٩٤٩ ژیاوە لەو شارە مردووە .

### خاکی گەلی مۆرۆ

زەوی خاکی مۆرۆ ئەکەوێتە ئەوپەڕی باکوری فلیپین کە پێکدێت لەم دوورگانە:دوورگەی (مینداناو) دووەم گەورەترین دوورگەیەجگە لە

دورگــەکانی (ئەرخــەبیل فلیــپین) کــە پێکــدێت لــە ۷۰۰۰دوورگــە و (ئەرخەبیل صولۆ)و (دوورگەی بالاوان) و (دوورگەی بازیلان) کە کۆی گشتی ڕووبەری ئەم دوورگانە ئەکاتە(۱۱٦۸۹٥)کلم دوجا کە سێ یەکی خاکی فلیپین پێکدێنێت،ژمارەی دانیشتوانی ئەم دوورگانە لە نێوان ۲۰ملێون بۆ ۲۱ ملێون کەسە. ژمارەی موسڵمانان لە فلیپین زۆر ڕوون نی یە و بە تەواوەتی دیار نی یە،ئەوەش بەهۆی ئەوەی حکومەتی فلیپین دەستی کردووە بە سیاسەتی نیشتەجێکردنی نەصرانی یەکان لە سەر خاکی موسڵمانان. ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە هۆی شەڕەوە نەگەشتۆتە فلیپین،بەڵکو بەهۆی بانگخوازو بازرگانە موسڵمانەکان بڵاوبۆتەوەو لە ساڵی ۱۲۰۰ زاینی بەشێوەیەکی بەرچاو بلابۆتەوە. ئاینی نەصرانی لە ساڵی ۱٥۲۱زاینی لەگەڵ گەشتنی ماجەلان لەوڵاتەدا بڵاوبۆتەوە.

## سامانی سروشتی

خاکی فلیپین لە ۷۰٪ بە کاردێت بۆ کشتوکاڵکردن و ئەتوانرێت بوترێت کە داهاتی سەرەکی خەڵکی فلیپین لەسەر کشتوکاڵ کردنە و پیشەی زۆربەی خەڵکەکەیەتی. سەرەکیترین کشتوکاڵ لە فلیپین برنجە کە ساڵانە ۳ملێون تەن برنج بەرهەم دێنێت. دووەم سەرچاوەی داهاتی خەڵکی فلیپین ڕاوکردنی ماسی یە کە خەڵکانێکی زۆر لەسەر ئەم سامانە سروشتی یە ئەژین. سروشتی فلیپین بە هۆی بوونی زۆری دوورگەکانی ئەم هەلەی زیاتر بۆ خەڵکی ڕەخساندووە. سێ یەم دارستان و بەرهەمی دارستانەکان یەکێکی ترە لەو پیشانەی کە خەڵکی

فلیپین سوود لە بەروبوومی وەردەگرن و لەسەری ئەژین. چوارەم،فلیپین خاوەنی جۆرەها کانزایە وەکو مس وئاڵتون و ئاسن و مەنگەنیزو کرۆم و زیو جیوەیە.

پینجەم،جگە لەوەی ئەم بەرهەمە پیشەسازیانە دروست ئەکرێت وەکو پلاستیك وکارتۆن و شوشەو پارچەی کانزای و فلیم سازوی و کۆکردنەوەی ئامێر.

ئەوەی جێگەی داخە کە ئەو خاکانەی موسڵمان لەسەری نیشتەجێن پڕن لە خێرو بێرو کانزاو سامانە سروشتی یەکان کەچی داهاتی ئەم خێرو بێرە خەڵکی ئەم ناوچانە سودی لێ وەرناگرن بەڵکو دانیشتوانی ئەم ناوچە موسڵماننشینانە لەوپەڕی هەژارو نەداری نەخوێندەواریی دا ئەژین و پارەو داهاتی ئەم هەموو خێرو بێرە ئەچێتە گیرفانی خەڵکانی ترەوە. حکومەتی مانێلا داهاتی ناوچە موسڵماننشینەکە خەرجەدەکات بۆ ناوچەکانی تر. ئەگەر شتێك خەرجبکات بۆ ئەم ناوچەیە یاخود بییەوێت کارێکی خزمەتگوزاری بکات ئەوا ناوچە موسڵماننشینەکان لە کۆتایی هەموو ناوچەکان دائەنرێت.

ئەگەر شاری بریرەی موسڵماننشین وەربگری،ئەبینی کە لەڕووی خزمەتگوزارییەوە تەواو پشتگوێ خراوە،کەچی حکومەتی مانێلا سود وەرئەگرێت لەو دارستانەی کە لە سنوری ئەم شارەدا هەیە و ساڵانە قازانجێکی باش ئەکات لە فرۆشتنی ئەو دارە کە بە ملێونەها دینار ئەخەمڵێنرێت.

## چڕی دانیشتوان لە فلیپین

فلیپین یەکێکە لەو ولأتانەی کە دانیشتوانەکەی بەزۆری لە ناوچەیەکدا بە چڕی ئەژین،لە کاتێکدا کە خاوەن خاکێکی فراوان و پان و بەرینە،بۆ وێنە دوورگەی (میند ناو)کە خاوەن خاکێکی پان و فراوانە کەچی ژمارەی دانیشتوانی کەمە. ڕەگەزی زاڵ لە فلیپین مالیزییەکانن کە بەر لە چەند هەزار ساڵێك کۆچیان کردوە لە مالیزو ئەندەنوسیاوە بۆی هاتوون.

لەم دواییانەدا هەندێك خەڵکی چین و ئیسپانی و ئەمەریکی ڕوویان لە فلیپین کردووە نیشتەجێبوون و زۆرێکیان بە هۆی ژن وژن خوازییەوە لەگەڵ خەڵکی فلیپین تێکەڵ بوون.جگە لەم ڕەگەزانە کۆمەڵێك ڕەش پێست لە فلیپین ئەژین و بەزۆری لە ناوچە دواکەوت و هەژارنشین و چیاکان و لەناو دارستانەکاندا ژیان بەسەر ئەبەن.

موسڵمانەکان لە ١١٪ دانیشتوانی ناوچەکانی باشور پێکدێنن کە لەم ناوچانەدان (دورگەی مینـدناو) و(ئەرخەبیل صـولو)و(دورگەی بالاوان).لە دورگەکانی ناوەڕاست و باکور موسڵمانان نزیکەی شەش ملێون کەس ئەبن. کۆمەڵێك بوزی و کۆمەڵێك لەوانەی بڕوایان بەڕۆح هەیە لە فلیپین ئەژین کە نزیکەی٢ ٪ دانیشتوان پێکدێنن.

## شێوە زارو زمانەکانی فلیپین

خەڵکی فلیپین بە زیاتر لە ٧٨ شێوە زمان قسە ئەکەن کە گرنگترینیان زمانی (تاغالوغ)ە ئەم شێوەیە بڵاو بۆتەوە لە نێوان مانێلای پایتەخت و ئەو شارو ناوچانەی کە دراوسێ ی پایتەختن ئەم شێوە یان زیاتر

بەشێوەزاری نیشتیمانی فلیپین دائەنرێت جگە لەم زمانە خەڵکی فلیپین بە هۆی داگیرکارییەکانەوە بە هەر یەکێك لەم زمانانە قسە ئەکەن لە کاتی داگیرکاری ئیسپانییەکان زمانی ئیسپانی بلاّ وبۆتەوە
لە کاتی داگیرکاری ئینگلیز زمانی ئینگلیزی بلاّوبۆتەوە،لە کاتی داگیرکاری ئەمەریکایی یەکان زمانی ئەوانیش بلاّوبۆتەوە،بەلاّم لە هەموو زمانەکان زیاتر کە بلاّو تر بێت زمانی ئینگلیزییە لە کارو بارە حوکمییەکان دا بەکار دەهێنرێت.

موسڵمانەکانی فلیپین بە دوو شێوە زار قسە ئەکەن

١- شیوە زاری (الثاوصو)ئەم شێوەیەیان نزیکە لە زمانی ئەندەنوسی یەکان.
٢- شێوە زاری (المراتاو) ئەم شێوە زارە زیاتر لە دوورگەکانی (میندناو) بلاّوەو نزیکە لە زمانی عەرەبی و وشەکانی بە عەرەبی ئەنوسرێت.

## موسڵمانان لە فلیپین

فلیپین یەکەم دەوڵەتی ئاسیاییە کە ئیسلام پێگەشت بێت لە سەر دەستی بازرگانە موسڵمانەکان و بانگخوازە عەرەبەکان لەساڵی (١٣١٠)کۆچی.
موسڵمانەکان هەستان بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی لە زۆرێك لە دورگەکانی باشور بەتایبەت دورگەی (میندناو) لەسەرەتایی سەدەی چواردەی زاینی تا سەدەی شانزەی زاینی
لە سەروەختی داگیرکاری ئیسپانی یەکان لە سەدەی شانزەهەم هەتا ساڵی ١٨٩٩ زاینی حوکمی ئیسلامی لە فلیپین کەوتە بەر هەوڵی ڕێلی

گیران و بەرتەسکردنەوەیدا ئەم حاڵە درێژەی کێشا تا کاتی داگیر کاری ئەمریکاییەکان ئەمان زیاتر هەوڵەکانیان چڕ کردووە هەردوو بەرەی باشورو باکوری ولاتیان بەستەوە بەیەکەوە بەر لە وەی سەربەخۆیی وەربگرێت فلیپین تا ساڵی ١٩٤٦ زاینی ئەمەش بووە هۆکاری شکستی موسڵمانان لە هەردوو دورگەی (سولو) و (سەڵتەنەی ماجندناو) کە نەیانتوانی سەربەخۆیی بۆ خۆیان بگێڕنەوە کە ئەوان چەند سەدەیەك بوو سەربەخۆ بوون.

موسڵمانانی فلیپین حکومەت بەوە تاوانبار ئەکەن کە هاوکاری ئەو کۆمەڵە مەسیحیی یە چەکدارانە ئەکات. ئەمەش بووە هۆکاری گرژی و ئاڵۆزی لە نێوان حکومەت و موسڵمانان لە فلیپین لە ساڵی ١٩٧٠ زاینی.

لە هۆکاری ئەو گرژی و ئاڵۆزیانە،موسڵمانەکان بەرەی نیشتیمانی بۆ ڕزگاری مۆرۆیان لە ساڵی ١٩٧٢ دروست کرد بۆ بەرگریکردن لە موسڵمانان هەر لەو ساڵەدا ڕوبە ڕوونەوەی چەکداری لە نێوان بەرەی مۆرۆ حکومەت ڕوویدا. هەرچەند ئەو شەڕوو ڕووبەڕووانە بۆ هیچ کام نەبووە مایەی سەرکەوتنیان،بەڵام پاش چوار ساڵ لە ڕووبەڕوونەوەو شەڕی چەکداری لە ساڵی ١٩٧٦ بەهۆی نێوان گیری حکومەتی لیبیا کۆمەڵێك وتووێژ ڕوویدا لە نێوان حکومەت و بەرەی مۆرۆی ئیسلامی کە دواتر بەڕێکەوتن مۆرکرا لە نێوانیان و بە (ڕێکەوتننامەی تەرابلوس) ناسرا.

یەکێك لە خاڵی ئەو ڕێکەوتنامەیە ئەوەبوو کە حوکمی زاتی بدرێت بە موسڵمانانی مۆرۆ،بەڵام حکومەت دەستاودەستییەکی زۆری دروست کرد بۆ ئەم ڕێکەوتنامەیە وبەندەکانی ناو ئەم ڕێکەوتننامەیەتەنها

حیبری سەر کاغەز بوو هیچ بەندو خاڵێکی نەچووە بواری جێبەجی کردنەوە.دواتر شەڕوو پێکدادان لە نێوان موسڵمانان و حکومەت دروست بوویەوە.

لە ساڵی ١٩٩٣ جارێکی تر بە نێوانگری ئەندەنوسیا لە نێوان حکومەت و بەرەی مۆرۆ دانوستان کرا. ئەم دانوستانە بۆ ماوەی ٣ ساڵ درێژەی کێشا لە ساڵی١٩٩٦ حکومەت و بەرەی مۆرۆ گەشتنە ڕیکەوتننامەیەك.یەکێك لە بەندی ڕێکەوتننامەکە ئەوەبوو کە (دامەزارەوی ئاشتی و گەشەپێدان) دروست بکرێت ئەم کۆمەڵەیە کار بکات لە باشوری فلیپین بۆ ماوەی سێ ساڵ دواتر ڕاپرسی بکرێت و خەڵکی ئەو ناوچانە خۆیان بڕیار بدەن کە سەر بە خود موختاری مۆرۆ بن یا بخرێنە سەر حکومەتی مەرکەزی و هەرچی چەکداری سەر بە مۆرۆ هەیە بخرێتە سەر سوپای مەرکەزی و تێکەڵ بکرێن،بەلأم موسڵمانان ترسی ئەوەیان هەبوو لە کۆی ١٤ یەکەی ئیداری تەنها ٥ یەکەیان موسڵمانان تێدا سەرکەوتووبن،چونکە حکومەتی مانێلا زۆر دەمێك بوو لە هەوڵی گۆڕینی دیمۆگرافی ئەو ناوچانەدا بوو،مەسیحیەکی زۆریان هێنابوو لە ناوچەی موسڵمانەکان نیشتەجێ کردبوون،بەمەش موسڵمانان بوو بوون بە کەمینە و ڕێژەی مەسیحییەکان زۆر زیادی کردبوو.

### بەرەی نیشتیمانی بۆ ڕزگاری مۆرۆ

ئەم بەرەیە لە ساڵی ١٩٧٢ دروست بوو،کاتێك سەرۆکی فلیپین(مارکۆس) حوکمی عورفی ڕاگەیاند لە باشوری فلیپین لەو ساڵەوە کێشمە کێشمی سەربازی لە نێوان مۆرۆ وحکومەت دروست

بوو.بە داخەوە موسڵمانەکان نەیانتوانی یەکریزی خۆیان بپارێزن دوو بۆچون دروست بوو لە ناو بەرەی مۆرۆدا:

١-سەلام هاشم پێی وابووکە چارەسەری کێشەی موسڵمانان لە فلیپین بەریگەی جیهاد کردن چارەسەر ئەکرێت.

٢-نور مسوار پێی وابوو کەرێگەی چارەی گونجاو بۆ چارەسەری کێشەی موسڵمانان دانوستان و گفتو گۆ کردنە لەگەڵ حکومەتی مانێلاو، داواکردنی هەندێ پوستی ناو حکومەت کێشەی موسڵمانان چارەسەر ئەکات.

ئەم دوو ڕاجیاوازیە زیاتر زەقبوویەوە لە ساڵی ١٩٧٦ کە (نور مسوار) بە نێوانگری موعەمەر قەزافی لە گەڵ حکومەتی مانێلا رێکەوتننامەیەکیان مۆرکرد کە بە رێکەوتننامەی تەرابلوس ناسرا. ئەم دوو ڕاجیاوازیە هەتا ساڵی ١٩٧٧ لە ژێر چەتری بەرەی مۆرۆ دا کاریان ئەکرد لە ساڵی ١٩٨٤ بون بە دوو باڵەوە.

١-سەلامات هاشم لە ساڵی ١٩٨٤ بەرەکەی خۆی ناونا (بەرەی ئیسلامی بۆرزگاری مۆرۆ

٢- نور مسوار بەرەکەی خۆی ناونا (بەرەی رزگاری مۆرۆی نیشتیمانی).

بەداخەوە زۆربەی کەناڵە ڕاگەیاندنەکانی ولاتە ئیسلامییەکانلەو سەردەمەدا لە هەوڵی پەردە پۆش کردنی ئەو نێووبردن و کوشتن و برینانەی حکومەتی مانێلا بوون حکومەتە ئیسلامییەکان ڕای جیهانیان چەواشە ئەکرد کە گوایە حکومەتی (مارکۆس) سەرقاڵی چاکسازی یە لە ناوخۆی ولاتدا.

تەنها ڕێکخراوێکی ئیسلامی لەو سەردەمەدا هاوکاری موسڵمانانی فلیپین بوو،ئەویش پەیوەندی جیهانی ئیسلامی بوو لە ساڵەکانی ١٩٧٢ بۆ ١٩٨٤ هاوکاری موسڵمانانی ئەکرد.

ئەو کارەساتانەی بەسەر موسڵمانی فلیپین دا هاتووە:

١- شەهیدکردنی (٣٠ )هەزارلە موسڵمانان کە زۆربەیان ژن و منداڵ و خەڵکانی بەتەمەن بوون.

٢- بە کۆیلەکردنی ٦ هەزار ئافرەتی موسڵمان لە سەر دەستی سەربازانی فلیپین.

٣- ئاوەرەکردنی زیاتر لە ملیۆنێك موسڵمان.

٤- ئاوەرە بوون و دەرکردنی بەزۆری نزیکەی ٣٠٠ هەزار لە موسڵمان بۆ ولاتانی دەرو دراوسێ بەتایبەت بۆ مالیزیا.

٥- سوتانی ٣٠٠ هەزار لە خانوو ماڵی موسڵمانان.

٦- تێکدانی ١٠٠ گوندو شاری موسڵمانان.

٧- داگیرکردنی خاك و زەوی موسڵمانان.

٨- وێرانکردن و ڕوخاندنی ٥٠٠ مزگەوت(لە کۆی ٢٥٠٠ مزگەوت کە لەسەرانسەری فلیپین دا هەیە).

هێرشە سەربازییەکانی حکومەتی فلیپین بەردەوامە تا دەستبگرن بەسەر موسڵمانان و لەناویانبەرن بە هۆی ئەو ئیبادە کردن و تێکدانی خانو بەرەوە و ڕوخاندنی شارەکانیان وداگیر کردنی زەوی و زاری یان موسڵمانان ئێستا لە لەوپەڕی هەژاری و نەداریدا ئەژین و نەخۆشی تییاندا بلاوبۆتەوەو،موسڵمانان بەهۆی ئەو حاڵ و گوزەرانە سەختەوە بوونەتە نێچیری کۆمەڵە تەبشیری و حیزبە شیوعی یەکان.

بەرهەمی جیهادی موجاهیدانی مۆرۆ:

موجاهیدانی فلیپین ڕووبەڕووی سێ گروپ شەڕ ئەکەن :

١- سوپای خاچ پەرستی حکومەتی فلیپین.

٢-ئەو گروپە چەکدارانەی لە مەسیحییە هاوردەکان دروستکراون.

٣- حیزبی شیوعی.

هەرچەندە حکومەتی مانێلا هەوڵەکانی چڕ کردۆتەوە بۆ لە ناوبرنی موسڵمانان،بەڵام بەرهەمی جیهادو ئیمانی موسڵمانان لەو وڵاتەدا.

بەرهەمی خۆی هەبووە و هەندێ لە وڵاتە ئیسلامییەکانو ڕێکخراوە ئیسلامییەکانکاری باشیان کردووە و هاوکاری موسڵمانە بەش مەینەتەکانی ئەو وڵاتەیان داوە،ئێستا ئەو ناوچانەی بەهۆی جیهادی موسڵمانانەوە پارێزراوە موسڵمانان تاڕادەیەکی باش ئاسودەن و خەریکی خۆڕێکخستنەوەن.

نزیکەی ٣٠ مامۆستای زانکۆی ئەزهەر لەگەڵ کۆمەڵێك لە مامۆستایانی سعودیەبە هاوکاری ڕێکخراوی خێرخوازی (پەیوەندی جیهانی ئیسلامی )لە و ناوچانەی کە بەدەست موسڵمانانەوە خەریکی فێرکردن و پێگەیاندنی قوتابیانن و بەسەدەها خوێندنگای سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی و زانکۆ کراونەتەوەو شەش کۆلێژ کراوەتەوە بە هەوڵ و کۆششی هەندێك کەسی خێر خواز هەرچەندە حکومەت ئەیەوێت ئەم خوێندنگایانە بخاتە سەر خۆی.

لەو دامەزراوانەی کە خەریکی فێرکردنن:

١- پەیمانگای مەندناوی عەرەبی ئیسلامی کە ٣١٦ خوێندنگە لەخۆ ئەگرێت.

٢- پەیمانگای هاداوی ئیسلامی ٥٢ خویندنگە لەخۆ ئەگرێت.

٣- کۆلێژی فکهام له شاری مەداراوی کە چەند خوێندنگەو پەیمانگا لەخۆ دەگرێت و بە زمانی عەرەبی وانەی تێدا ئەخوێنرێت.

٤- زانکۆی فلیپینی ئیسلامی کە ناسراوە بە پەیمانگای کاملی ئیسلامی له زۆربەی شارەکان بەشی کردۆتەوە.

٥- مەڵبەندی مەلیك فەیصەل بۆ خوێندنی ئیسلامی و هەندێ بنکەی زانستی سەر بەم مەڵبەندەن بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی.

٦- زانکۆی مەنداناو.

کیشەو گرفتی بەردەم موسڵمانانی فلیپین:

١- دواکەوتوویی و نەزانی،بەهۆی پشتگۆی خستنی لایەنی خزمەتگوزاری وخوێندن لە ناوچە موسڵماننشینەکان لەلایەن حکومەتی مەرکەزی یەوە دەستگیراوە بەسەر هەموو داهات و سامانە سروشتی یەکانی ئەو ناوچانە.

٢- دەرکردنی نیشتەجێیەڕەسەنەکان کەموسڵمانەکانن و بەزۆر هێنانی هەزارەها مەسیحی بۆ ناوچەکەیان.

٣- ڕووبەڕووبوونەوە وپێکدادانە سەربازییەکانی نێوان بەرەی مۆرۆ و سوپای فلیپین،بەهۆی ئەم شەڕانەوە تائێستا یەك ملیۆن لە موسڵمانانی فلیپین ئاوارە بوون و لە دوورگەی(الصباح)لەمالیزیا ئەژین.

٤- دور خستنەوە پشتگوێخستنی موسڵمانان لە کاروباری حکومەت بە جۆرێك تائێستا یەك نوێنەریان نی یە لەحکومەتدا.

٥- ئەو پەرتەوازەییەی کە لەنێوان هەردوو بەرەی موسڵماندا هەیە لە سەر شێوازی کارکردن و ڕووبەڕووبوونەوە کە لایەکیان داوای

سەربەخۆیی تەواوەتی ئەکەن و ئەوی تریان بە هەندێك پۆستی حکومی ڕازین.

٦- لاوازی ئەو گرنگیدانی نێو دەوڵەتی و وڵاتە ئیسلامییەکانبەکێشەکەیان.

٧- دروستکردنی کێشە بۆ موسڵمانان لەلایەن حکومەتەوە و پێنەدانی مافەکانیان و دروستکردنی گروپی مەسیحی چەکدار لە دژیان.

تێبینی /مۆرۆ ئەم ناوە ئیسپانییەکان بە موسڵمانەکانی فلیپین یان ئەوت.

# ئازاری موسڵمانان له‌ ئۆزبه‌كستان

## (وڵاتی بوخاری موحه‌ددیسی گه‌وره‌)

سه‌ره‌تایه‌ك بۆ ناسینی

ئۆزبه‌كستان ده‌وره‌ دراوه‌ به‌م وڵاتانه‌: كازاخستان له‌باكورو له‌ باشوره‌ وه‌قیرغیزستان

له‌ ڕۆژهه‌ڵاته‌وه‌ تاجیكستان و له‌ ڕۆژئاواوه‌ توركمانستان

ژماره‌ی دانیشتوانی ئۆزبه‌كستان:

ژماره‌ی دانیشتوانی: ٢٥٠٠٠٠٠٠ كه‌سه‌

له‌ ٦٠٪ له‌ هۆزی ئۆزبه‌كی یه‌و هه‌ندێ كه‌مه‌ نه‌ته‌وه‌ی تری تێدایه‌ وه‌كو تاجیكی و كازاخستانی و قیرغیزی و ئیغۆری و ڕوسی و كوردی تێدایه‌.

گرنگترین شاره‌كانی ئۆزبه‌كستان

سه‌مه‌رقه‌ند. بوخاری.قۆقه‌ند،خیوا. ئۆرغانش. قارشی . ته‌رمزی. ئانجان. نمنغان

### پایته‌ختی ئۆزبه‌كستان

ته‌شقه‌ند( پێشتر پایته‌ختی ئۆزبه‌كستان سه‌مه‌رقه‌ند بووه‌،به‌ڵام كاتێك ڕووسه‌كان له‌ساڵی ١٩٢٠ ویستیان به‌ره‌ نگاری موسڵمانه‌كان ببنه‌وه‌و ئاینی ئیسلام له‌ناو خه‌ڵكی نه‌هێڵن،خه‌ڵكی سه‌مه‌رقه‌ند زۆر به‌توندی به‌رپه‌رچیان داناوه‌و ناچار ڕووسه‌كان پایته‌ختیان برده‌ ته‌شقه‌ند، چونكه‌ له‌ ته‌شقه‌ند نزیكه‌ی نیو ملیۆن ڕوسی له‌وێ ئه‌ژیان).

ڕێژه‌ی موسڵمانان

موسڵمانەکان لـه ٨٢٪ ڕێـژەی دانیـشتوان پێـك دێـنن زۆربـەیان ئـەهلی سونەت و جەماعەتن.
زۆربەی دانیشتوانی ئۆزبەکستان لـه ڕەگـەزی ئۆزبـەکن و موسـڵمانن کـه ڕێژەیان ٦٨ ٪ پێکدێنن.
قیرغیزی یەکان ڕێژەی له:٤ ٪ پێك دینن
تاجیکی یەکان ڕێژەی له:٥ ٪ پێك دێنن
ڕوسەکان ڕێژەی له:١٠ ٪ پێك دێنن
کوردەکان ڕێژەی له:٥٪پێك دێنن
ئـەم ڕەگەزانـه هـەموویان موسڵمانن جگـه لـه ڕووسەکان نـەبێت بەمـەش ڕێژەی موسڵمانان له ئۆزبەکستان له ٨٢٪ پێکدێنن
زمان : ئۆزبەکی . ڕوسی
له ساڵی ١٩٩١ سەربەخۆیی وەرگرت له ڕوسیا
له ساڵی ١٩٩٢ دەستوریان نوسـی یـەوە بەحساب دەوڵەتێکی عـەلمانی دیموکراتی یه
دراو / سوم

ئۆزبەکستان وبەرهەمی کشتوکاڵ

ئۆزبەکـستان وڵاتێکـی کـشتوکاڵی یـه بەرهەمـەکانی گـەنم و بـرنج و گەنمەشامی بەرهەم دێنێت.
ساڵانه نزیکەی ٥ ملیۆن تەن لۆکه بەرهـەم دێنێت و جگـه لـه هـەبوونی نزیکەی ١٠ ملیۆن ئاژەڵ کەبەرهـەمی ساڵانەیان ئەگاتـه نیـوەی هـەموو یـەکێتی سـۆڤیەت لەبەرهـەمی خـوری ونزیکـەی سـێ یـەکی ئاوریـشم بەرهەم دێنێت.

سەرەتای گەیشتنی ئاینی ئیسلام بە ئۆزبەکستان

ئۆزبوکستان و ولآتانی تریش کە بە ولآتی ئەوبەری ڕووبار ناسراوە ئاینی ئیسلامیان لە سەردەمی فتوحاتی خیلافەتی ڕاشیدینەوە پێگەشتووە.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە سەردەمی خیلافەتی عوسمانی کوڕی غەفان گەشتە ئۆزبەکستان،بەڵام ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەشێوەکی کەم تێدا بڵاوبوویەوە ولە سەردەمی خیلافەتی ئومەوی یەکان بوو بە تایبەت سەردەمی عبد الملك ی کوڕی مەڕوان و کوڕەکانی دابوو وەلیدو سلێمان و هیشام. لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی عبدالعزیز خەڵکی ئۆزبەکستان پۆل پۆل هاتنە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە لە ساڵەکانی ٩٩کۆچی بۆ ١٠١ کۆچی.

ئۆزبەکستان و سەرکردە ئیسلامی یەکان

ولآتی ئۆزبەکستان یەکێکە لەو ولآتانەی کە خزمەتی گەورەی بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام کردووە، گەورە زانایانی فەرمودەی تێدا هەڵکەوتووە وەکو بوخاری و ترمزی ونەسائی و زەمەخشەری بیرونی و ئیبن سینا،ئەم زانا فەرمودە ناسانە تاجی سەری ئومەتی ئیسلامن. لە ئێستادا کە ڕابوونی ئیسلامی لە ئۆزبەکستان لە برەودایە کۆمەڵێك زانای بەڕێز سەرکردایەتی ڕابوون ئەکەن،کە ئەوانیش:

١- شێخی گەورەی زانایان عەبدول وەلی قاری یە کە تەمەنی ١٠٥ ساڵە لە ١٩٩٥ حکومەتی ئۆزبەکستان سەرەو نکومی کردووەو هیچ هەواڵێك لەبارەیەوە نازانرێت.

٢-زاناو بانگخواز مەفوە عابد قاری بەناو بانگترین ئیمام و خەتیبی ئۆزبەکستان بوو کە زمان پاراوترین و قسە زانترینیانە لە سەر دەستی ئەودا بە هەزارەها گەنج و ڕۆشنبیری شیوعی لەسەر دەستی موسڵمان بوون.

٣- موفەسیری گەورە عەبدول ئەحەد قاری ئیمام و خەتیبی شاری نمنکان.

٤-شێخ و بانگخواز محمد ڕەجەب قاری ئیمام و خەتیب لە شاری قۆقند.

٥- بانگخواز محمد خان قاری لەسەردەمی شیوعییەت مامۆستاو بانگخواز بوو بەنهێنی کاری ئیسلامی ئەکرد.

٦- بانگخواز ڕۆحەدین فەخرەدین ئیمام و خەتیب لە لە مزگەوتی نورەدین خواجە لە پایتەخت کە ئێستا گیراوە و لە بەندیخانەکان ژیان بەسەر ئەبات.

### ئاینی ئیسلام لە سەردەمی ئاگرو ئاسنی شیوعیەتدا

موسڵمانانی ئۆزبەکستان حاڵیان وەکو سەرجەم گەل و نەتەوەکانی تری ئاسیای ناوەڕاست بوو کە کەوتبوونە ژێر حوکمی پڕ لەتاوان و جینۆسایدی حیزبی شیوعی.

ئەم گەلە موسڵمانە حیزبی شیوعی بە جۆرەها شێوە دژایەتی ئەکردن و قورئان خوێندنی لێ قەدەغە کردبوون،تەنانەت حیزبی حاکم ڕێگری ئەکرد لێیان کەناوی ئیسلامی بەکار بهێنن،ئەمە سەرەتاییترین مافی ئینسانە کە بیانەوێت هەر ناوێکی بوێت بۆ منداڵی بەکاری بهێنێت.

حیزبی شیوعی لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی حوکمی دا سەرجەم مزگەوتەکانی داخست و هەموویانی کردە شوێنی ئارەق خواردنەو بەخێوکردنی بەراز. بەهۆی ئەو دژایەتی کردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە تاریکی و نەزانی باڵی کێشا بەسەر خەڵکی ئۆزبەکستان ودوور کەوتنەوە لە ئاینی ئیسلام و کۆمەڵێك خەڵکی کەم نەبێت لە دۆڵی (فەرغانە) بە ئاگا بوون لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام.ئەم حاڵی نەزانی و تاریکی یە درێژەی کێشا هەتا زەمانی ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت.

## دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت

زوڵم و زۆری شیوعییەکان گەشتبووە چڵە پۆپە بە جۆرێك کە مێژووی بە هەزارەها لاپەڕەی ڕەشی تۆمارکردووە لەسەر تاوان و کارە خراپ و بەدەکانیان. لەسەردەمی حیزبی حاکم هیچ بوارێك نەما بوو بۆ خەڵکی تا بە ئازادی بژین یاخود بیرو ڕایەکی جیایان هەبێت. بەهەموو شێوەك دژی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوون و سەرجەم مزگەوتەکانیان داخستو کردیان بە یانەی خواردنەوە و شوێنی بەخێو کردنی بەراز،بەڵام دوای هەموو تاریکی و ناڕە حەتی یەك خۆری ئازادی هەڵدێ.
بە ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت خەڵکی ئیسلامخوازی ئۆزبەکستان گەڕانەوە بۆ باوەشی ئیسلام وسەرجەم چین و توێژەکانیان باوەشیان بەئاینی ئیسلام دا کردەوەو دەستیان کرد بە کردنەوەی مزگەوتەکان کە ساڵانێك بوو بە هۆی حیزبی شیوعی یەوە داخرا بوو.
بەجۆرێك تامەزرۆی گەڕانەوە بوون بۆ ئاینی ئیسلام جگە لە مزگەوتە کۆنەکانی خۆیان بەیارمەتی و هاوکاری موسڵمانان مزگەوتی نوێیان

دروستکرد ئەو حەماسەتەی کەئۆزبەکی یەکان بۆ ئاینی ئیسلام هەیانە له ناو هیچ گەلێکی تردا نی یە.

## دوای ڕووخانی یەکێتی سوڤیەت و حاڵی موسڵمانان

ئۆزبەکی یەکان لە دوای ئەوەی کە یەکێتی سۆڤیەت ڕووخا بە سەرجەم چین و توێژەکانیان گەڕانەوە باوەشی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و زۆر بە تامەزرۆییەوە خەریکی کردنەوەی مزگەوتەکان بوون،کە ساڵانێك بوو لێیان زەوت کرا بوو،بەڵام ئەم ئازادی یە تا سەر نەبوو.
حیزبی حاکم و سەرۆکی وڵات (کریمۆڤ ) کەوتنە دژایەتی کردن و ئاینی ئیسلام و موسڵمانان و،سەر لە نوێ ڕێگریان کرد لە کردنەوەی مزگەوتەکان و نەیانهێشت هاوکارییان لە دەرەوەی ئۆزبەکستان بۆ بێت تا موسڵمانان مزگەوتی نوێ دروست بکەن. ڕێگرییان کرد لە هەموو چالاکی و جموجۆڵە ئیسلامییەکانو نەیان ئەهێشت بە مکەبەرە بانگ بدرێت لە مزگەوتەکان و سەر لە نوێ کەوتنە داخستنی مزگەوتەکان و ئەوانەی ڕیش یان ئەهێلا یەوە لەلایەن حکومەتەوە ئەگیران و نەیان ئەهێشت ئافرەتان بالاپۆش بن .
دەستیان کرد بەڕەشبگیری ئیمام خەتیبی مزگەوتەکان تەنها لە شاری( نامانجان)٩٨ مزگەوت هەبوو هەمووی داخرا ئێستا تەنها نۆ مزگەوت کراوەتەوە.
زۆربەی ئەوانەی ئێستا لەسەر سوڵتەن پێشتر لە دەزگای ئەمن و ئاسایش بوون و پێشتر لە دەزگای موخابەراتی (K.G.B) بوون،بۆیە بۆ موسڵمانان ئێستا حاڵیان هەر وەکو سەرەمی حیزبی شیوعی جاران

وایە بگرە خراپتریش،بەڵام خەڵکی ئیسلام خوازی ئۆزبەکستان دوای ئەو هەموو دژایەتی کردن و ناڕەحەتییانە هەر پابەندن بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە و ئەیانەوێت دەوڵەتێکی ئیسلامی دروست بکەن.

## ئازارو ئەشکەنجەو زیندانی موسڵمانان

دوای ئەوەی موسڵمانانی ئۆزبەکستان،بە هەموو چین و توێژەکانییەوە باوەشیان کردەوە بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام و ئەیانویست ئاینی ئیسلام حوکمیان بکات،بەڵام حیزبی حاکم چاوی بە ئاینی ئیسلام هەڵنەئەهات بۆیە کەوتنە دژایەتی کردنی ئاینی ئیسلام و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی حکومەت کەوتنە ئازار دانی موسڵمانان وبە شێوەیەکی هەڕەمەکی خەڵکی یان دەسگیر ئەکرد تاکە تاوانێك هەیانبوو موسڵمان بوونیان بوو بەپێی هەندێك سەرچاوە نزیکەی ٣٠ هەزار لە موسڵمانان بەژن و پیاو و کچ وکوڕەوەلەگەڵ خەڵکانی بەتەمەن گیراون.

ئەوەی لە خوارەوە ئاماژەی پێ ئەکەم دڵۆپێکە لە ئۆقیانووسی ئازارو ئەشکەنجەو دژایەتی موسڵمانان لە ئۆزبەکستان:

١- سەرجەم گیراوەکانی حیزبی ڕزگاری کە حیزبێکی ئیسلامی یەجیا کراونەتەوە لە هەموو گیراوەکانی تر.

٢- هەموو گیراوێك لە بەندینخانەکانی ئۆزبەکستان ئەبێت دووکاتژمێر ئیش بکەن تەنها گیراوە ئیسلامی یەکانی حیزبی ڕزگاری نەبێت کە ئەبێت ٨ کاتژمێر زیاتر ئیشیان پێ ئەکەن لەو نیشانەی کە پێیان ئەکەن لە بەندینخانەکان وەکو شۆردنی

ئاودەست ئەگەر نەیان کردوو سەرپێچی بکەن ئەوا بە دڕندە ترین شێوە لێیان ئەدەن.

لەناوئاوەدەستدا بەتاکە کەسی بەندیان ئەکەن

٣-بەهەموو جۆرێك ڕێگری نوێژیان لێ ئەکەن و ناهێڵن هیچ واجبێکی دینی ئەنجام بدەن. ئەگەر ببینن بەندی یەك نوێژ ئەکات و پێی بزانن ئەوا زۆر بە شێوەیەکی وەحشیانە ئەکەونە لێدانی و وەکو سزایەکی کاتی کارکردنی بۆ درێژ ئەکەنەوە.کاربەدەستانی بەندینخانەکان بەزۆر نوسراوێك بە بەندی یەکان پڕ ئەکەنەوە و بەرزی ئەکەنەوە بۆ سەرۆکی دادگاو تێدا ئەنوسن کە حاڵوگوزەرانیان لە بەندینخانەکان زۆر باشەو مامەڵەی باشیان لە گەڵدا ئەکرێت.

٤-لێپرسراوانی حیزبی ڕزگاری لە بەندینخانەکان ئەخرێنە بەردەستی کۆمەڵێك جەلادی دڵڕەق تا بەئارەزووی خۆیان سزایان بدەن،دوای لێدان و ئەشکەنجە تێکەڵ ئەکرێن لەگەڵ ئەو بەندیانەی کە لەسەر دزی و هەتیوبازی و شتی خراپ گیراون.

٥- یەکێك لە لێپرسراوانی حیزبی ڕزگاری لەلایەن پاسەوانی بەندینخانەکەوە بەزۆر کاری خراپی لەگەڵ دا کراو بۆ ئەوەی ئیهانەی بکەن بردیانە بەردەم هاوڕێکانی لە بەندینخانە و پێیان وت بۆ هاوڕێکانت بگەڕێوە کە چیمان لێ کردیت لە سەر ئەوەی نوێژت کرد .

بەم کارەیان ئەیانەوێت ئەندام و لێپرسراوانی حیزبی ڕزگاری ئیسلامی ناشرین بکەن لەبەرچاو یەکتری ئیهانەیان بکەن.

٦--لێپرسراوانی حیزبی ڕزگاری بەزۆر برسی ئەکرێن ونانیان نادەنێ ئەم حاڵە بەدەیان جار دووبارە ئەکرێتەوە تەنانەت ئەو خواردنەی لەلایەن کەسو کاریانەوە بۆیان دێت نایاندەنێ تا برسی بن.

٧-موسڵمانەکان ئەخرێنە لای ئەو بەندیانەی کە نەخۆشی مەترسی داریان هەیە وەکو سیل و هەوکردنی جگەرو زۆر جار دەرزییان لێئەدەن بێ ئەوەی پێیان بڵێن کە ئەم دەرزییە بۆچی یە!

٨-لە نیسانی ٢٠٠١ ڕێکخراوی خاچی سوور سەردانی بەندیخانەکانی ئۆزبەکستانی کرد لێپرسراوی بەندیخانە بە هۆی پاسەوانی بەندیخانەوە هەڕەشەی لە بەندیەکان کردبوو کە نابێت هیچ بەندییەك بۆی نییە باسی ئەشکەنجەو ئازارە کانیان بکات و ڕاستییەکان بدرکێنن ئەگەر هەر بەندی یەك ڕاستییەکان بدرکێنێت بۆ ڕیکخراوی خاچی سور،ئەوا ئەبێت چاوەڕێی مەرگ بکات.

لێپرسراوی بەندینخانەکە بەڵێنی بە بەندیەکان دابوو کە ئێشو ئازاریان لەسەر کەم بکاتەوە و زۆرێکیان ئازاد بکات و ڕێیان پێبدات کە نوێژەکانیان بکەن و دەسبەجێ کۆمەڵێك بەرماڵی دابەش کردبوو بەسەر بەندییەکان.

هەندێك لەو بەندیانەی کە ئەیانزانی ڕاستی ئەڵێن بە پەلە گواستیانەوە بۆ بەندینخانەیەکی تر تا ڕاستییەکان بۆ ڕیکخراوی خاچی سور باس نەکەن،بەڵام ئەوە ڕاستییەکی تاڵە هەرکاتێك ڕیکخراوەکان دێن ئازارو ئەشکەنجەی سەر بەندییەکان سوك ئەکەن کاتێك ڕێکخراوەکان ئەڕۆن دەست ئەکەنەوە بە ئازارو ئەشکەنجەی بەندییەکان بە چەند بەرامبەر خراپتر،ئەمە حاڵی هەموو بەندییە موسڵمانەکان لە سەرجەم بەندینخانەکانی ئۆزبەکستان.

٨- بەسەدەها گەنج لە ئافرەتان وکوڕان لە ژێر ئەشکەنجەو ئازاری وەحشیانەی ناو بەندیخانەکان شەهید بوون .

# ئازاری موسڵمانان له فەڵەستین

یەكێكە لەوڵاتەكانی كیشوەری ئاسیا و دەورە دراوە بەم وڵاتانەی لای خوارەوە: لەڕۆژهەڵاتەوە سوریاو ئەردەن لە باكورەوە بەشێكی سوریاو لوبنان لە باشورەوە بیابانی سیناو عەقەبە لە خۆرئاواوە دەریای سپی ناوەڕاست.

ڕووبەری خاكەكەی :٢٧٠٠٩ كیلۆمەتر چوارگۆشەیە

ژمارەی دانیشتوان : ١١ملیۆن كەسە

پایتەخت : قودسی پیرۆز

شـارەكانی فەڵەسـتین بـۆ سـێ جـۆر پـۆلێن دەكرێـت بـەم شـێوەی لای خوارەوە:

شارە تێكەڵەكان كە هاوڵاتی جولەكەو عەرەبی تێدایە وەكو (حەیفا . یافا .ئەللد . بیئرسەبعە . عەككا . ڕەملە.

شارە عەرەب نشینەكان (ناصرە . فەحم . ئەلتیبە . ڕەهد .شەفاعەمرو . باقەل غەربیە . سخنین . قلنسوە.

ئەو شارە تێكەڵانەی دوای ساڵی ١٩٤٨ عەرەبی تێدانەما:

تەبەریا . صەفد . بیسان .ئەلمەجدەل . ئیسدود.

## ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی فەڵەستین

فەڵەستین یەکێکە لە خاکە دێرینەکان و لانکەی زۆرێك لە شارستانییەتەکانە،لای هەرسێ ئاینە ئاسمانییەکە بەخاکێکی پیرۆز دائەنرێت.

بەلای مەسیحییەکانەوە شوێنی لەدایك بوونی حەزرەتی مەریەمەو،حەزرەتی عیسا(علیه السلام)یش لەوێ لەدایك بووە، بە بڕوای مەسیحی یەکان حەزرەتی عیسا (علیه السلام) لەوێ وەفاتی کردووە و گۆڕەکەی لە کڵێسای قیامەیە،جگە لە چەند پیرۆزیەکی تری مەسیحی یەکان.

جولەکەکان خاکی فەڵەستین بەپیرۆز ئەزانن و بەبڕوای ئەوان خوای گەورە ئەو خاکەی بەش کردووە بەسەر نەوەکانی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب (سەلامی خوایان لێ بێت)،جگە لە بوونی هەیکەلی حەزرەتی سولەیمان (علیه السلام).

بەلای موسڵمانەکانەوە خاکی فەڵەستین پیرۆزە،چونکە یەکەم قیبلەی موسڵمانان بووەو شوێنی لەدایك بوونی زۆرێك لەپێغەمبەرانە کە ئێمە وەکو موسڵمان جیاوازی لە نێوان هیچ کام لەپێغەمبەران ناکەین،جگەلەوەی لە چەند سورەتێك دا باسی پیرۆزی خاکی فەڵەستین کراوە وەکو سورەتی ئیسراو مەریەم و ئەنبیا باسی موبارەکی ئەم خاکە کراوە،هەروەها چەند مزگەوتێکی تێدایە وەکو مزگەوتی بوراق و مزگەوتی عومەر،بۆیە لەبەر ئەم پیرۆزییانەی سەرەوە فەڵەستین گرنکی یەکی تایبەتی هەیە.

# کێشەی موسڵمانان له فەڵەستین

موسڵمانانی فەڵەستین،کێشەکەیان لە نێوان زەلیلی عەرەبی و بێ ڕەحمی دەسەڵاتداران و زۆردارانی جیهانیدایە. خاکی گەلێك بەزۆر داگیر ئەکەن و دەوڵەت بۆ کۆمەڵێك دروست ئەکەن کە وەکو قەرەج هەر کۆمەڵەو لە دەوڵەتێکەوە دێنن و لە سەر خاکی فەڵەستین نیشتەجێیان ئەکەن.

دانیشتوانە کەشی ئاوارەی وڵاتە دراوسێکان ئەکەن،لەناوخۆی وڵاتیش ڕۆژانە بەدەیەها کەسیان لێ شەهید ئەکەن بەجۆرێك دەست ناپارێزن لە منداڵ و ئافرەت و بەتەمەن و کەم تەمەن،هەرکەس کەوتە بەر شاڵاوی دڕندانەو وەحشیگەرانەی جولەکە دڵڕەقەکان شەهیدی ئەکەن و جیهانیش بێ دەنگە لەو قەتڵەو عامەی بەرامبەریان ئەکرێت.

بیری داگیرکردن خاکی فەڵەستین لای جولەکە

بۆ یەکەم جار بیری زایۆنی وەکو بزووتنەوەیەکی یەهودی لەسەر زاری ناتان برنباوم لە ساڵی ١٨٩٠ ناوبرا،ناوی زایۆنییش (زایۆن شاخێکە لەخوار قودسەوە لە تەورات دا ناوی هاتووە)،مەبەست لە هەڵبژاردنی ئەم ناوە،گەڕانەوەی جولەکە بوو بۆ خاکی فەڵەستین.

دواتر زاراوەی زایۆنی لای یەهودەکانی ڕۆژئاوا چەکەرەی کردو لەچەند کتێبێکیشدا ئامارەی پێکراوە،وەکو کتێبی (بحث عن الصهیونی هەش کایشر ١٧٩٥- ١٧٨٤ ) هەروەها کتێبی (ڕۆماو قودس ١٨١٢- ١٨٧٥ )،ئەمەش بووە سەرەتای چەکەرە کردنی بیری زایۆنی وەکو یەهود

سامییەو ڕەچەڵەکی عیبریەو پاکن و پێویستیان بە پاك ڕاگرتن هەیە لە خاك و وڵاتێك دا کەئێستا نیانە:

١-فەڵەستین خاك و وڵاتی دێرینی یەهودو ئیسرائیلە .

٢-دەوڵەت تاکە زامنێکە بۆ کۆڵنەبوونەوەی یەهوود،بەهۆی پرۆسەی دژ بە سامییەت.

٣- سەرکەوتنی یەهود لەو دەوڵەتە،جیهانیش پێی دەحەسێتەوە.

وەکو ڕێکخستن و پەیڕەوی کردنیش،لەبەرنامەیەکی سیاسی دا ساڵی ١٨٩٧ بەسەرپەرشتی هرتزل خاوەنی کتێبی (الدولة اليهودية) کۆنگرەی زایۆنی لە بازل – سویسرا بەستراو جاڕی ڕێکخراوێکی زایۆنی درا بە ئامادەبوونی زیاتر لە ٢٠٠ نوێنەری جیهان تێدا بڕیاردرا فەڵەستین بکەنە نیشتیمان بۆ جولەکە. لەسەردەمی عوسمانییەکاندا کاتێك سوڵتان عبدالحەمیدی دووەم لەسەر حوکم بوو،جولەکەکان داوای کڕینی خاکی فەڵەستینیان لە سوڵتان کرد،بەڵام سوڵتان ڕازی نەبوو یەك بست لە خاکی موسڵمانان بفرۆشێت،لەوکاتەدا نوێنەری یەهودییەکان ٥ ملیۆن لیرەیان دا بەسوڵتان،بەڵام سوڵتان ئەوخیانەتەی نەکرد. دواتر لە ڕێکەوتننامەی بەلفۆر لە ساڵی ١٩١٦ خاکی ئیسلامی یان پارچەپارچە کردو بەڵێن درا بە جولەکە خاکی فەڵەستینیان پێ بدەن.

وەزیری دەرەوەی بەریتانیا،ئەرشەر بلیفۆر لە ٢-١١- ١٩١٧ بەڵێنی بە یەهودییەکان دا لەسەر خاکی فەڵەستین دەوڵەتێك بۆ جولەکە دروست بکات.

دواتر لەبەر ئەوەی ئینگلیز هاوکاری عەرەبی کردبوو لە شۆڕش دژی خیلافەت،هەردوو دەوڵەتی عێراق و سوریایان بۆ دروست کردن و مەلیك فەیسەڵیان کرد بە مەلیکی عێراق.

مەلیك فەیصەڵ لەگەڵ وایزمانی نوێنەری جولەکەو لۆرانس ڕێکەوتننامەیەکیان ئیمزا کرد لە ٣-١-١٩١٩ کە دانیینا بەڕێکەوتننامەی سایکس – بیکۆ و بەڵێنی بلیفۆرو مەلیك لە جیاتی عەرەب مۆری کردو وایزمانیش لەجیاتی فەڵەستینیەکان دەقی ڕێکەوتننامەکەیان مۆر کرد،کە نۆ مادده بوو.لە ساڵی ١٩٤٨ قەوارەکەیەکیان بۆ جولەکە دروست کرد لەسەر خاکی فەڵەستین لە ژێر دروشمی (لەنیلەوە تا فورات– من النیل الی فرات ). لە ١١- ٣- ١٩٤٩ نەتەوە یەککگرتوەکان دانیان نا بەدەوڵەتەکەدا.

لەدوای شکستەکەی ١٩٦٧،فەڵەستینییەکان بە تەنیا مانەوە و خۆیان هەستان بەدروست کردنی هێزی بەرگری و چالاکی دژی ئیسرائیلی داگیر کەر ئەنجام ئەدا و چەند پارتێکی سیاسی دروست بوو لەوانە :

١-بزووتنەوەی فەتح کە باڵێکی سەربازی هەیە بەناوی (سرایا القدس).
فەتح زۆرتر خەریکی سازشکردنە لە گەڵ دەوڵەتی ئیسرائیلی داگیرکەردا و ئێستا پێگەی جەماوەری زۆر لاواز بووە.

٢-بزووتنەوی حەماس بالێکی سەربازی هەیە بەناوی کەتائیب عیزالدین قەسام.

٢- بزووتنەوی جیهاد .

لێرەدا ئاماژە بە ژیانی شێخ ئەحمەد یاسین دامەزرێنەری بزووتنەوەی حەماس ئەکەین ئەو پیاوە کەمئەندامەی تەنها سەری

ئەجولاّ کەچی ئیسرائیلیەکانی هێنابووە سەرچۆك و لەرزی خستبووە دڵیانەوە:

ناوی تەواوی: ئەحمەد ئیسماعیل یاسین

شوێن و ساڵی لەدایك بوونی: عەسقەلان . ٢٢- یۆنیۆی -١٩٣٦

خێزاندارەو ١١ منداڵی هەیە ٣کوڕو ٨ کچی هەیە

ئاین: موسڵمان .سونی مەزهەب

کارێ سیاسی: دامەزرێنەری بزووتنەوەی بەرگری ئیسلامی (حەماس ) لە ١٥ – کانونی یەکەمی – ١٩٨٧.

یەکەم دەرکەوتنی شێخ ئەحمەد یاسین لە دوای شکستی ١٩٦٧ وە بوو لەڕێگەی بەشداری کردنی لە خۆپیشاندان و وتارەکانییەوە بوو لە مزگەوتی عەباسیی لە کەرتی غەزە و دواتر ڕێکخراوێکی خێرخوازی دروستکرد بۆ هاوکاری کەسوکاری خێزانی شەهیدو گیراوەکان.

لە ساڵی ١٩٥٤ جارێك گیراوە دواتر لە ساڵی ١٩٦٥ بۆ جارێك تر دەستگیر کراوەتەوە لە ساڵی ١٩٨٨ ئەدەن بەسەریدا و ماڵە کەی ئەپشکنن و هەڕەشەی دوورخستنەوەی لێ ئەکەن بۆ لوبنان.

لە ساڵی ١٩٨٩ بۆ جارێکی تر لە گەڵ سەدان چالاکەوان و کادری چالاکی بزووتنەوەی حەماس ئەگیرێتەوە وحوکمی پانزە ساڵ زیندانی ئەدرێت بەسەریدا بەتۆمەتی دژایەتی کردنی دەوڵەتی ئیسرائیل.

لە ١-١٠- ١٩٩٧ لەسەر داوای حسین بن تەلاّلی پادشای ئەردەن ئازاد ئەکرێت.

لەساڵی ٢٠٠٣ دووجار هەوڵی تیرۆرکردنی ئەدرێت و سەر ناگرێت.
لە کاتی چونی بۆ نوێژی بەیانی لە٢٢- مارس- ٢٠٠٤ لەرێگەی هەلی کۆپتەرەوە سێ ئاراستەکراو شەهید کرا لە گەڵ دوو کوڕی و حەوت لە هاوەڵانی.

## دڵۆپێك لە ئازارو مەینەتی گەلی ستەمدیدەی فەڵەستین

ئەگەر بەوردی باسی هەموو قەتڵو عامەکانی جولەکە بکەین دژ بە گەلی بێتاوانی فەڵەستین،ئەوا بەنوسینێکی ئاوا کورت نابێت، بەڵکو بە چەند کتێبێ ڕەنگە ئەنجا بتوانین سەرژمێری وردی تاوانی ئیسرائیلییەکان بکەین دژ بە فەڵەستینییەکان.

ئەم چەند خاڵە دڵۆپێکە لەزەریایەك :

١-لە ١٠-٤-١٩٤٨کوشتارە بێ بەزەییەکەی دێر یاسین لەسەردەستی هێزەکانی ئیسرائیل کە ٢٥٠ کوژاوی لێ کەوتەوە لە ژن و منداڵ پیرو گەنج.

٢- لە ١٩-١- ١٩٤٨ کوشتاری صەفد ڕویدا لەسەردەستی سوپای ئیسرائیل.

٣-لە ١٣-١١-١٩٦٦ هێزەکانی جولەکە هێرشیان کردە سەر گوندی سموع و ١٨ کەسیان شەهید کردو ٥٤ کەسیان برینندار کرد و ١٥٠ خانویان خاپوور کرد.

٤-لە ١٨-٩-١٩٨٢ کوشتارە بێبەزەی یەکەی صەبراو شاتیلا نزیکەی ٣٥٠٠ کەس کوژرا ن لە ماوەی چەند سەعاتێکدا بێ جیاوازی تەمەن و هەمووئەوانەی کوژران و ئاوارە بوون و خەڵکی مەدەنی بوون.

٥-له٥-١- ١٩٨٣ هێزەکانی بەریتانیا له گوندی عتێل دەستیان کرد به کوشتنی منداڵ و ئافرەت و پیاوی بەتەمەن و سوتانی مزگەوت و قورئان.

٦- له ٨-١٠- ١٩٩٠ لەکاتی نوێژ کردنی موسڵمانان له گۆڕەپانی قودس هێزەکانی ئیسرائیل ١٥٠ نوێژ خوێنیان شەهید کرد.

٧- له ١٧-١٢- ١٩٩٢( ٤٥٠) کەس له بزووتنەوی حەماس و جیهادی فەڵەستینی دوور خرانەوە بۆ مرج الزهور له باشوری لوبنان.

٨- له ٦-١- ١٩٩٦ یەحیا عەیاش شەهید کرا.

٩- له ساڵی لەنێوان ساڵی ٢٠٠٠ بۆ ٢٠٠٨ ٥٢٦٤ منداڵ شەهید کرا کەتەمەنیان له ١٨ ساڵ کەمتر بووە تەنها له هێرشەکانی ئەم دواییەی سەر کەرتی غەزە ٤١٧ منداڵ شەهید بووە.

ئەم نمونانەی سەرەوە دڵۆپێکە له زەریای ستەم و تاوانی جولەکەکان دژ به گەلی موسڵمانی فەڵەستین به جۆرێك کەم ڕۆژ هەیە ئەم گەلە بێ کەسە بەبەر چاو هەموو دونیا وە زوڵمی لێ نەکرێت کەچی هەموو دنیا بۆ کوشتنی موسڵمانان کەڕو کوێرو لاڵن.

# ئازاری موسڵمانان له ئەفغانستان

ئەفغانستان یەکێکە لەوڵاتە ئیسلامی یەکانی کیشوەری ئاسیا و ئەکەوێتە ناوەندی ئاسیاو دەورە دراوە بەم وڵاتانە:
لە ڕۆژهەڵاتەوە پاکستان لەڕۆژئاواوە ئێران لە باشورەوە تاجیکستان و ئۆزبەکستان و لەباکورەوە تورکمانستان
پێکهاتەی نەتەوەیی لە ئەفغانستان
پەشتۆن: ٤٠ ٪
تاجیك: ٢٥٪
هەزارە: ٢٠ ٪
ئۆزبەك :٥ ،٧٪
تورکمان٢:٪
پێك هاتەی تر:٥ ،٤٪
زمان :له ٥٠٪ بە شیوەی دورییەی فارسی قسە ئەکەن
لە :٣٥٪ بە زمانی پەشتۆن قسە ئەکەن
لە ٨٪ بە زمانی ئۆزبەکی قسە ئەکەن
کەمینەیەکی کەم بە زمانی عەرەبی قسە ئەکەن کەلە مەزار شەریف ئەژین
ئاین . ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاینی خەڵکی ئەفغانستانە لە ٨٠٪ سونەمەزهەبن و لە ٢٠٪ شیعە مەزهەبن
کەمینەیەکی زۆر کەم سیخ و هیندۆس هەیە لە ئەفغانستان
ژمارەی دانیشتوان :٢٧ ملیۆن کەسە

ڕووبەری خاکەکەی :٦٥٢٠٠٠کلیۆمەتر چوار گۆشەیە

ژمارەی پارتە سیاسی یەکانی :-١٢ پارتی سیاسی

شارە گرنکە کانی .

کابول پایتەخت . قەندەهار .مەزارشەریف .هیرات . بەلخ . بامیان

ئەفغانستان لە :٣٠ ویلایەت پێکهاتووە

## ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی ئەفغانستان

بەهۆی پێگە و شوێنی ستراتیجییەوە،ئەفغانستانەوە مێژوویییەکی دێرینی هەیە. جگە لەوەی خاڵی بەیەك گەشتنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو باشورو ناوەندی کیشوەری ئاسیایە. خاکی ئەفغان لانکەی زۆرێك لەهۆزو گەلە ئازاو جەربەزەکان بووە کە زەمەنێك خەریکی شەڕ کردن بوون وخاوەن ئیمپراتۆریەتی گەورە بوون.

لەوانە مەقدۆنی یەکان بەسەرکردایەتی ئەسکەندەری مەقدۆنی و فتوحاتی ئیسلامی و مەغۆلەکان وغەزنەوییەکان و تەیمورییەکان ........ هتد.

لەسەدەی هەژدە،هۆزی پەشتون دەرکەوتن و لەساڵی ١٧٠٩بەسەرکردایەتی ئەحمەد شاە درانی قەندەهاریان کردە پایتەختی ئەمارەتەکەیان و کۆتا مەلیکیان لە ساڵی ١٧٤٧ بوو. لە ساڵی ١٧٧٦ پایتەخت لە قەندەهارەوە گوازرایەوە بۆ کابول. لە کۆتایی سەدەی نۆزدە،ئەفغانستان کەوتە ناو گێژاوی شەڕی هەردوو زلهێزی ئەو سەردەمە ئیمپراتۆریەتی ڕووس و بەریتانی. لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو،ئەفغانستان کەوتە ناو شەڕێکی ماڵوێرانکەری

ناوخۆوەو بەهۆی ئەم شەڕەوە لەساڵی ١٩٧٩ یەکێتی سۆفیەت خاکی ئەفغانستانی داگیرکرد.

## حکومەتی شیوعی لە ئەفغانستان

لە ساڵی ١٩٧٣ بەهۆی کودەتاکەی محمد داود خان ی سەرۆك وەزیران بەسەر کوڕی مامی دا مەلیك محمد زاهیر شاه سیستەمی حوکمی وڵاتی گۆڕی بۆ شیوعییەت.

لەسەردەمی دەسەڵاتی شیوعییەکان ئەفغانستان ئارامی بەخۆیەوە نەبینی،چونکە ئەوانیش لە ناو خۆیاندا کێشەیان زۆر بوو –حیزبی گەلی مارکسی بوون بە دوو پارچەوە بەشێکیان ناوی حیزبی گەل بوو بە سەرۆکایەتی نور محمد تەرقی وحەفیزوڵا ئەمین و حیزبی دووەمیش ناوی بەرشم بوو بەسەرۆکایەتی بابراك کارمل. ناکۆکی ئەم دوو حیزبە گەشتە ڕادەی خوێنڕشتن و خەڵکی ئەفغان دژی ئەو دوو حیزبە مارکسی یە زۆرجار خۆپیشاندانیان لە دژیان ئەکرد گەورەترین ڕووبەڕوو بونەوەش لە نێوان خەڵك و حیزبی شیوعی دەسەڵاتدار لە نورستان ڕوویدا.

دواتر نور محمد تەرقی کوژرا و حەفیزوڵا ئەمین شوێنی گرتەوە. لە ساڵی ١٩٧٣ بابراك کارمل بە پاڵپشتی زرێپۆشی ڕووس گەشتە کابوڵ،ئەمە بوو بەسەرەتایی داگیر کاری ڕووس بۆ ئەفغانستان ولەو بەروارەوە خەڵکی ئەفغانستان جیهادی یان ڕاگەیاند دژ بە یەکێتی سۆفیەتی داگیرکەر.

## جیهاد دژی ڕووسی داگیرکەر

هەموو هێزو ڕەوتە چەکدارەکانی ئەفغانستان و زۆرێك لەلاوانی وڵاتە ئیسلامییەکان(وەکو سعودیە و یەمەن و ئەردەن و سوری کە بە عەرەبە ئەفغانی یەکان ناسرابوون) دژ بە داگیرکاری ڕووس وەستانەوەو نزیکەی ١٠ساڵ جیهادیان کرد. هەر بەهۆی شەڕی ئەفغانستانەوە بوو کە یەکێتی سۆفیەت هەڵوەشایەوە و لە ١٥ فیبرایەر ١٩٨٩ یەکێتی سۆفیەت هەموو هێزە چەکدارەکانی خۆی لە ئەفغانستان کشانەوە.

دوای ئەو سەرکەوتنەمەزنەی کە موجاهیدان بە دەستیان هێنان هێزە داگیرکەرەکانیان لە خاکی ئەفغان وەدەر نا،جاریکی تر تارمایی شەڕی ناوخۆ لەناو هێزە چەکدارەکان لەسەر گەشتن بە کورسی دەسەڵات دروست بوویەوە،چونکە هیچ هێزێکیان ئامادە نەبوو دەستبەرداری کورسی دەسەڵات ببێت بۆ ئەوی تر. ململانێ لەنیوان حیزبی ئیسلامی بەسەرۆکایەتی قەلبەدین حیکمەتیار و کۆمەڵەی ئیسلامی بەسەرۆکایەتی بورهانەدین ڕەبانی و ئەحمەد شاە مەسعودو عەبدو ڕەشید دۆستەم دروست بوو،هەریەك لەمانە خاوەن هێز و هۆزیك بوون ئەیانویست دەستبگرن بەسەر وڵاتدا. جگە لەوەی وڵاتانی دراوسێ ئەیانویست ئەو هێزەی لەوانەوە نزیکە ئەو پشکی شێری بەر بکەوێت.

دواتر هێزە چەکدارەکان ڕێکەوتن کە صبغەتوڵا مەجددی بۆ ماوەی دوو مانگ بکرێت بەسەرۆك و دواتر سەرۆکایەتی بدرێت بە بورهانەدیت ڕەبانی بۆ ماوەی چوارمانگ سەرەك وەزیران بدرێت بەقەلبەدین حیکمەتیارو وەزارەتی بەرگری بدرێت بە ئەحمەد شاە مەسعود.بەڵام ئەم ڕێکەوتننامەیە زۆری نەخایەند هێزە چەکدارەکان تێکچوون

قەلبەدین حیکمەتیار هاوکاری عەبدورەشید دۆستەمی کرد تا تۆپبارانی کابوڵی بکات،بەو هۆیەوە سەر لەنوی شەڕ لە نێوان هێزە چەکدارەکان بۆ جارێکی تر دروست بوویەوە.

بەهۆی بوونی شەڕی ناوخۆو پێکنەهاتنی هێزە چەکدارەکان،لە ئەفغانستان زەمینە ساز بوو بۆ دروست بوونی بزووتنەوی تاڵیبان.

تاڵیبان دەستیگرت بەسەر زۆرێک لەناوچەکانی ئەفغان و بە دەرکەوتنی ئەم بزووتنەوە تازەیە هاوکێشەی هێز گۆڕا،بەجۆرێك حیکمەتیار هەڵهات و چوو بۆ ئێران و عەبدو ڕەشید دۆستەم ڕایکرد بۆ ئۆزبەکستان و ئەحمەد شاه مەسعود چووە دۆڵی پەنجشێر و خۆی تێدا قایم کرد تا دژی بزووتنەوەی تاڵیبان شەڕ بکات .

عەرەبە ئەفغانییەکان کێن ؟

بەو گەنج و لاوانە ئەوترا کە لەسەردەمی شەڕکردن دژ بە یەکێتی سۆفیەت هاتبوونە ئەفغانستان بەمەبەستی جیهاد دژ بە ڕووسەکان دیارترین سەرکردەی عەرەبە ئەفغانی یەکا ئەمانە بوون:

١- عبداللە عەزام

٢- ئوسامە بن لادن

٣- ئەیمەن زەواهیری

٤-

- دیارترینیان عبداللە عەزام بوو: ئەمەی خوارەوە کورتەیەکە لە ژیاننامەکەی:

-ناوای تەواوی عبداللە یوسف موستەفا عەزام

-ساڵی لەدایك بوون ١٩٤١:

-شوێنی لەدایك بوون : گوندی سیله حاریسه لە جنین لە باکوری فەڵەستین

-پیشە مامۆستای زانکۆ بوو لە ئیسلام ئاباد.

-دامەزرێنەری یەکەم گروپی جیهادی بوو لە فەڵەستینی داگیرکراو.

-خێزانداره پێنج کوڕو سێ کچی هەبوو بەناوەکانی (محمد . ابراهیم حەمزە. موصعەب .حوزەیفە کچەکانیی (فاتیمە . وەفا . سومەیە)

-بەرپرسی نوسینگەی کاروباری موجاهیدە عەرەبەکان بوو لە پاکستان

-گۆڤارێکی مانگانەی دەرئەکرد بەناوی( رسالة الجهاد )لەگەل بلأوکراوەیەکی هەفتانە بەناوی (لهيب المعركة)

-بەرواری شەهید کردنی ٢٤-١١-١٩٨٩ ئۆتۆمبیلەکەیان تێنتی ڕێژکردبوو خۆی و دووکوڕی شەهید بوون بەناوەکانی (محمد تەمەنی ٢٠ ساڵ . ابراهیم تەمەنی ١٥ ساڵ )

دانراوەکانی شەهیدی سەرکردە عبدالله عەزام:

١- الإسلام ومستقبل البشرية .

٢- إلحق بالقافلة .

٣- حكم العمل في جماعة .

٤- الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر .

٥- حماس :الجذور التأريخية والميثاق .

٥- السرطان الأحمر .

٦-العقيدة وأثرها في بناء الجيل .

٧- المنارة المفقودة .

٨- في الجهاد آداب وأحكام .

٩- جريمة قتل النفس المؤمنة .
١٠ - بشائر النصر .
١١- كلمات على خط النار الأول .
١٢- آيات الرحمن فى جهاد الأفغان.

سەرەتایەك بۆ ناسینی هەندێ لەسەرکردەکانی ئەفغانستان

- ئەحمەد شاە مەسعود

ڕەگەز: تاجیکی
لەدایك بووی ٢: -یەنایەری - ١٩٥٣
شوێنی لەدایك بوون : جانكلاك . دۆڵی بەنجشێر
نازناوی : شێرەکەی بەنجشێر، ڕزگارکەری کابوڵ، هاوڕێی باش
زمان : فارسی زمان دایك . فەرەنسی . پەشتۆنی زانیوە
خێزاندار بوو خاوەن پێنج کچ و یەك کوڕ ە
قوتابی کولێژی ئەندازیاری بوو
دواتر بەهۆی داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن ڕووسیاوە دەستی دایە بەرگری و ڕۆڵێکی کاریگەری بینی لە وەدەر نانی ڕووسی داگیر کەر لە خاکی ئەفغانستان.
چەند پلەو پۆستی بالأی وەر گرتووە لەوانە.. وەزیری بەرگری .. جیگری سەرۆك کۆمار .سەرکردەی پەیمانی باکور ( کەلەدوڵی بەنشێر دژ بەتاڵیبان ئەجەنگان)
ڕۆژی تیرۆر کردنی: ٩ - سێبتەمبەری - ٢٠٠١ لەشاری خۆجەبەهادین

- عەبدو ڕەشید دۆستەم

ڕەگەز : تورك

مێژووی لەدایك بوونی :١٩٥٤

شوێنی لەدایك بوون : لە شاری خواجە دو کو لەباکوری ئەفغانستان

لە ساڵێ ١٩٨٠ پەیوەندی ئەکات بەسوپای ئەفغانستانەوە دژ بە موجاهیدان ئەجەنگێت

لە ساڵێ ١٩٩٢ پەیوەندی ئەکات بە هاوپەیمانی باکور بەسەرپەرشتی ئەحمەد شاه مەسعود دژ بە قەلبەدین حیکمەتیار شەڕیان ئەکرد

دوای گرتنی کابوڵ لەلایەن بزووتنەوەی تاڵیبانەوە پاشەکشە ئەکات بە هێزەکەیەوە بۆ مەزار شەریف

ساڵی ١٩٩٦ ئەفغانستان جێ ئەهێڵێت بەرەو تورکیا ئەڕوات پاش ئەوەی جێگرەکەی پەیوەندی ئەکات بە بزووتنەوەی تاڵیبانەوە

لەساڵی ٢٠٠٣ پاش ئەوەی بزووتنەوی تاڵیبان لەسەر حوکم نامێنێت ئەگەڕێتەوە بۆ ئەفغانستان و لەلایەن حامید کارزایەوە پۆستی وەزیری بەرگری پێ ئەدرێت

لە ساڵی ٢٠٠٨لە پۆستەکەی لائەبرێت دوای ئەوەی تۆمەتی ڕفاندنی هەندێ کەسی سیاسی ئەخرێتە پاڵ.

- قەلبەدین حیکمەتیار

شوێنی لەدایك بوون : لە شارۆچکەی ئیمام صاحب . سەر بەهەرێمی قەندوز

هۆز : پەشتۆنی

ساڵی لەدایك بوون ١٩٤٧:

له ساڵی ١٩٧٠ پەیوەندی ئەکات بە حیزبە چەپەکانەوە لە ساڵی ١٩٧٢ ئەگیرێت.

دوای ئـەوەی داود خـان دێتـە سـەرحوکم لـە سـاڵی ١٩٧٣ هەڵـدێت بـۆ پاکستان و لـە پاکستان بزووتنـەوەی ئیسلامی دائەمـەزرێنێت. یەکێك بووە لە سەرکردە دیارەکانی جیهاد لـە ئەفغانستان لـە ساڵی ١٩٧٩ – ١٩٨٩.پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرت لە دوای دەرچوونی ڕووس لە ئەفغانستان

لە ساڵی ٢٠٠١ هەڵدێت بۆ ئێران. دوای ئەوەی ئەمـەریکا بڕیـاری داگیر کردنـی ئەفغانستان ئـەدات حیکمـەتیار ئەچێتەوە بـەرەی جیهـاد دژ بـە ئەمەریکا.

لە ١٠ – فیبرایەر– ٢٠٠٢هەموو نوسینگەکانی بزووتنەوەکەی لە ئێران دائەخرێن و هەتا ئەم ساتە دژ بە ئەمەریکا ئەجەنگێ.

- بورهانەدین ڕەبانی

هۆزی : یەفتلین . سەر بە گەلی تاجیکی سونی مەزهەب

ساڵی لەدایك بوون : ١٩٤٢

شوێنی لە دایك بوون : شاری فەیز ئاباد . لە هەرێمی بەدخشان

لەساڵی ١٩٦٣کۆلێژی شەریعەی تەواو کردووە .

لـە سـاڵی ١٩٧٢ – ١٩٧٤ سـەرۆکی کۆمەڵـە ئیـسلامی بـوو پـۆلیس لـە سـاڵی ١٩٧٤ لـە نـاو حـەرەمی زانکـۆ هـەوڵی دەسـتگیرکردنیاندا،بەڵام بەهۆی قوتابییەکانی یەوە توانی هەڵبێت.

لــە ســاڵی ١٩٧٧ هەڵبــژێرا بەســەرۆکی بزووتنــەوی ئیــسلامی،بەڵام بزوتنەوەی ئیسلامی بوو بە دوو بەشەوە بەشێکیان بەناوی بزوتنـەوەی ئیسلامی مانـەوە بەسەرۆکایەتی حیکمـەتیار و بەشـەکەی تری بـەناوی کۆمەڵەی ئیسلامی بەسەرۆکایەتی بورهانەدین ڕەبانی.

لە ساڵی ١٩٧٩ بەشداری جیهادی ئەفغانی کردو هێزەکەی ئەو یەکەم هێز بوو کە چونە ناو کابوڵەوە

لــە بــەرواری ٢١-٩-٢٠١١لــە کــابول کەســێکی خۆکــوژ خــۆی پێــدا تەقاندەوەو کوشتی.

تاڵیبـان توانیـان لـە سـاڵی ١٩٩٦ دەسـت بگـرن بەسـەر زۆربـەی خـاکی ئەفغانستان

## تـاڵیبان کێن ؟چۆن دروست بوون

تاڵیبان بەزمانی پەشتۆنی،واتا تەلەبە(خوێندکار)، تاڵیبان کۆی وشـەی خوێندکارە.

لــە ســاڵی ١٩٩٤ هــەواڵی ڕفانــدنی دوو کــچ بڵاوبوویــەوە لــە خــاڵێکی پشکنین لـە سانج هیسار نزیك شـاری قەندەهار،موحەمـەد مـەلا عومـەر بەبیــستنی ئــەم هەواڵــە ٣٠ چــەکدار ئەنێرێتــە ســەر ڕفێنــەرانی دوو کــچەکەو هەمووبانــدە ڕفێنەرەکـە ئـەگرن ودوو کـچەکە ئازاد ئەکـەن و ســەرکردەی ئــەو گوروپــە لەسێدارە ئــەدەن، ئەمــە یەکــەم چــالاکی گرووپەکەی موحەمەد مەلا عومەر ی سەکردەی تاڵیبان بوو.

بەهۆی ئەم کـردەوە خـەڵکی لـە موحەمـەد مـەلا عومـەر کۆبوونـەوە زیـاتر خوێندکارە ئیسلامییەکانی لە دەوور کۆبونـەوە بۆ یە نـاوی بزووتنـەوە

کەی نرا تاڵیبان توانیان لە ماوەی دوو ساڵ دا زۆربەی خاکی ئەفغان بخەنە ژێر چنگی خۆیان .

خەڵکی لەشەڕوو ئاشوبی نێوان هێزە چەکدارەکانی تر بێزار بوون بوون،بۆیە بزووتنەوی تاڵیبانیان بە فریاد ڕەس ئەزانی بۆ ئەو بارو دۆخە خراپەی کە ئەفغان تێیکەت بوو. تاڵیبان پشتگیری کرا لە لایەن زانایانی ئاینی یەوە زۆربەی سەرکردە کان یان لە زانا یانی ئاینی و خوێندکارە ئیسلامییەکانبوون

پێکهاتەی سەرەکی تاڵیبان لەهۆزی پەشتۆن بوو.

باردۆخی ئەفغانستان لەسەردەمی تاڵیبان:

تاڵیبان توانی بەشێکی زۆر گەروەلە خاکی ئەفغان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و هەوڵیدا ولات بەڕووی جیهانی ئیسلامی دا بکاتەوە بۆ ماوەیەك ئارامی ئاسایش گەڕایەوە بۆ ئەفغان،هەروەك چۆن وتەبێژی فەرمی بزووتنەوەی تاڵیبان مەلا عەبدولمەنان نیازی لەڕۆژی ٣-١١-١٩٩٤ ڕوونیکردەوە کە ئامانج لەدروست بوونی بزووتنەوە کەیان گێڕانەوە ی ئارامی و ئاسایشە بۆ خەڵکی ئەفغانستان و دادپەروەریکردنە لەناو چین وتوێژو هۆزە جیاوازەکان.

دوای سەرکەوتنی بزووتنەوی تاڵیبان توانی ئەم هەنگاوانە بنێت:

١- دەوڵەتێکی ئیسلامی دابمەزرێنێت.
٢- ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکات بە یاسای سەرەکی.
٣- زانایانی ئاینی بکات بە کاربەدەست و پلەی باڵایان بداتێ لە حکومەتدا.

٤- هەوڵی نەهێشتنی گروپە چەکدارە یاساغەکانیدا،چ ئەوانەی سەر بەهۆزەکان بوون یان ئەوانەی خەریکی چەتەیی و ڕێگری بوون.

٥-پەرەپێدانی پەیوەندی لەگەڵ وڵاتە ئیسلامی یەکان.

٦- دروست کردنی دەستەی فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە.

٧- هەوڵدان بۆ بنبڕکردنی بەدڕەوشتی و تاوان و نەهێشتنی مادە هۆشبەرەکان.

٨-دروستکردنی سوپایەکی نیزامی.

٩- هەوڵدان بۆ بەرەو پێشچوونی باری دارایی وڵات.

١٠- داواکردنی هاوکاری لە وڵاتە ئیسلامییەکانبۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەفغانستان.

١١- کۆکردنەوی زەکات و خێرو صەدەقەو سەرفکردنی لە بواری خزمەتگوزاری گشتی دا.

## تاڵیبان و شەڕی ئەمەریکا

لە ١١- ئەیلول – ٢٠٠١ ئەو ڕۆژەی لە مێژووی بزووتنەوی تاڵیبان بە ڕۆژێکی مێژوویی دائەنرێت،چونکە نەکەوتە ژێرباری هەڕەشەی ئەمەریکاوە بەدەستەوەدانی ئوسامە بن لادن کە بەلای ئەمەریکاوە ئوسامە لەپشت ڕوودای تەقانەوەی سەنتەری بازرگانی بوو لە نیویۆرك.

لە تشرینی یەکەم لە ساڵی ٢٠٠١ ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی شەڕیان دژی بزووتنەوی تاڵیبان ڕاگەیاند.

لە ١٣ تشرینی دووەم کۆتایی بە حوکمی تاڵیبان هات لەسەردەستی بەرەی هاوپەیمانی باکور بەهاوکاری ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی.
زۆرێك لەسەکردەکانی تاڵیبان شەهید بوون و زۆرێکیان لێ گیرا.
دوای گرتنی خاکی ئەفغانستان لەلایەن ئەمەریکاوە:
موجاهیدانی بزووتنەوەی تاڵیبان درێژەیان بەجیهاد کردن دا دژ بە ئەمەریکاوهاوپەیمانە کانی بە جۆرێك گورزی گورچك بڕ ئەوەشێنن لە ئەمەریکا زیان بە سەربازەکانیان ئەگەین کە هیچ کات ئەمریکابە خەیاڵی دا نەئەهات بەم چەشنە شکست بخوات و ئامانجەکەی نەپێکێ.
هەندێك لەچالاکی یە سەربازی یەکانی تاڵیبان دژ بە ئەمەریکا
١- لە مانگی ئازاری ٢٠٠٢ دوو هەلی کۆپتەری ئەمەریکایان خستە خوارەوە.
٢- لە ٥ - ئەیلولی ٢٠٠٢ هەوڵێ کوشتنی حامید کارزای سەرۆکی ئەفغانیان دا.
٣- لە کانونی دووەمی ٢٠٠٣ هەلیکۆپتەریکیان خستە خوارەوە لەگەڵ کوژرانی ٤ سەرباز کە لەگەڵ فڕۆکەکەدا بوون.
٤- تشرینی دووەم ٢٠٠٣ سەرکردەی هیزە ئاشتی پارێزەکان (ئاندرۆلیسی ) ڕایگەیاند کە بزووتنەوەی تاڵیبان دەستی گرتووە بەسەر بەشێك لە خاکی ئەفغانستان.
٥- کانونی دووەم ٢٠٠٤ (٨) سەربازی ئەمەریکییان کوشت لە ناوچەی غەزنە.
٦- لە نیسانی ٢٠٠٤ هێرشیان کردە سەر بنکەیەکی سەربازی ٧ سەربازییان کوشت.

٧- لە ١٦ – ئەیلول ٢٠٠٤ بۆ دووەم جار هەوڵی کوشتنی حامید کارزایان دایەوە.

ئەمەو بە هەزارەها چالاکی تر کە بەجۆرێك ئەمەریکاو ناتۆ و هیزە بێگانە کانی تۆقاندووە زۆر جار سەربازی داگیرکەران خۆیان ئەکوژن.

لە ٢٠٠٩ هێزە داگیر کەرەکان ڕایانگەیاند کە ٣٠٠٠ سەرباز یان بەدەستی موجاهیدانی تاڵیبان کوژراوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بزووتنەوی تاڵیبان بەرەو بەهێزی ئەچێت و چالاکییەکان سەخترو بەهێزتر ئەبێت بەجۆرێك چەند جارێك هێرش یان کردۆتە سەر وەزارەتی داد و وەزارەتی ناوخۆ و بەندینخانەی مەرکەزی ) جگە لەوەی زەرەو زیانی زۆرئەگەین بە سوپای ئەمەریکا و بەدەیان جار دراوە لەو کاروانەیان داوە کە سوتەمەنی بۆ سەربازانی ئەمەریکی ئەگوازنەوە.

## وتەیەکی کورت

ئەوەی بە ووردی سەرنج بدات لەجیهادی ئەفغان ئەبینێت موجاهیدانی ئەفغان ئەو دارەی ڕواندیان بە خوێنی هەزارەها شەهید بەر لەوەی بەرهەمەکەی بخۆن کەوتنە گیانی یەکتری بەتەنها لەشەڕی ناوخۆدا ٦٠هەزار کەس بوونە قوربانی ئەوەش هەمووی بەهۆی وڵاتە دراوسێکانییەوە بوو کە نەیانئەویست گەلی ئەفغانی بکەوێتە سەر سکەی خۆی و بەئارامی بژی،چونکە بەرژەوندی (ئێران و سعودیەو پاکستان و ئەمەریکا ) هەریەکەی بەجۆرێك بوو پێکهاتە تێکەڵەکەی ئەفغانستان بەو هەموو هۆزو نەتەوەو مەزهەبە جیاوازەوە لە ئەفغانستان باشترین هۆکار بوو بۆ هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ.

# مسوڵمانانی ئـــــــەوروپا

## ئازاری موسڵمانان لە بۆسنە و هەرسك

سەرەتایەك بۆ ناسینی بۆسنە و هەرسك: -

بۆسـنە ئەکەوێتـە ناوەڕاسـتی ئـەوروپاوەو دەورە دراوە بـەم وڵاتانـەی خوارەوە:

لـە باکورو باشـوروخورئاوایەوە وڵاتـی کرواتیـا و لـە ڕۆژهـەڵاتی یـەوە صربیا ولەباشوری خۆرئاواوە کۆمارەکانی جەبەل ئەسوەد .

ڕووبەری خاکەکەی:٥١٢٢٢ کیلۆمەترە

پایتەخت : سەرایڤۆ

ژمارەی دانیشتوان : ٤٣٣٠٠٠٠ کەسە

لە٣٦٪ شارنشینن و لە٦٤ ٪ گوندنشینن

دراو : دیناری بۆسنی

زمان: بە شێوە زمانێك قسە ئەکەن پیێ ی ئەوترێـت صربیی کرواتـی وشەکانیان بە ڕوسی ئەنوسرێت

ئاین : موسڵمان ٤٥٪

ئەرسەدۆکس: ٤٠٪

ئاینی تر :١٥٪

شارە گرنگەکانی بۆسنە

سـەرایڤۆ - بانیـا لۆکـا- تـۆزلا-بیهـانیش- موسـتا- بـلاوو جوسـینە- سریبنتسا

بەرهەمی کشتوکاڵی

مانگا. گیلاس . تری . گەنمە شامی . قۆخ . هەرمێ .بەرقوق . فول صۆیا. پەتاتە.گێزەر .توتن

بەرهەمی پیشەسازی: دروست کردنی کەرەستەی کشتوکاڵی . قوماش

سامانی سروشتی: ئاسنی خاو

ئاوڕدانەوەیەك له مێژووی بۆسنه

بۆسنه له سەدەی ١٢ زاینی بۆ سەدەی ١٥ زاینی لەلایەن هەندێك له پاشا مەجەڕیەکان و صربییەکانەوە، ئەم داگیرکرا ئەمداگیرکارییە درێژەی کێشا تاساڵی ١٣٢٦ زاینی.له ساڵی ١٣٢٦ لەلایەن یەکێك له حاکمەکانی بۆسنییەکانەوە وڵات ئازاد کرا، له ساڵی ١٤٦٣ عوسمانییەکان هاتن و بۆسنەیانگرت.

بۆسنه له ژێر دەستی عوسمانییەکان مایەوە تا کۆنگرەی بەرلین،ئەم کۆنگرەیە بەرسەرکردایەتی چەند سەرکردەیەکی گەورەی ئەوروپی بەسرا لەساڵی١٨٧٨ زاینی. دوای کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی بۆسنەو هەرسك کەوتە ژێر ناوی مەملەکەتی صرب و کروات و سلۆفینیا و دواتر ناوەکەی گۆڕا بۆ یوگسلاڤیا له ساڵی ١٩٢٩ زاینی.

لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانی بەسەرکردایەتی ئەڵمانیاو یوگسلاڤیاو ئیتالیا هەڵگیرسا. کرواتیا بۆ ماوەیەك وەکو وڵاتێکی سەربەخۆ کاری ئەکرد بە ڕواڵەت،بەڵام له ژێر دەسەڵاتی ئەڵمانەکان دا بوو.

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی شیوعییەکان دەستەڵاتیان گرتە دەست و یوگسلاڤیا بوو بە دەوڵەتێکی فیدراڵی.

له‌ ساڵی ۱۹۹۰ زاینی هه‌ڵبژاردن ئه‌نجامدرا و حیزبی شیوعی كه‌مترین رێژه‌ی كورسی په‌رله‌مانی به‌ده‌ست هێنا.ساڵی ۱۹۹۱ هه‌ریه‌كه‌ له‌ كرواتیا و سلۆفینا سه‌ربه‌خۆیی خۆی ڕاگه‌یاند.

له‌ ساڵی ۱۹۹۲ راپرسییه‌ك كرا له‌ بۆسنه‌و هه‌رسك داوای سه‌ربه‌خۆییانكرد،به‌ڵام له‌لایه‌ن ئه‌و صربییانه‌ی نیشته‌جێ ی بۆسنه‌ بوون ره‌ت كرایه‌وه‌ .

صربه‌كان به‌هاوكاری سوپای یوگسلاڤیا دژی موسڵمانانی بۆسنه‌ كه‌وتنه‌ شه‌ڕو ئه‌م شه‌ڕه‌درێژه‌ی كێشا تا ساڵی ۱۹۹۵ به‌رده‌وام بوو.

دڵۆپێك له‌ ئازاری موسڵمانانی بۆسنه‌

موسڵمانانی بۆسنه‌ له‌ كۆتایی ساڵی ۱۹۹۲ تا ساڵی ۱۹۹۵ له‌وپه‌ڕی نه‌هامه‌تی و ئێش و ئازاردا ژیانیان ئه‌برده‌ سه‌ر. به‌به‌ر چاو دنیاوه‌ به‌هه‌زاره‌ها گه‌نجیان لێ ئه‌كوشتن و به‌هه‌زاره‌هاماڵیان ئه‌ڕوخاندن و به‌سه‌ده‌ها ئافره‌تی موسڵمان ده‌ستدرێژی ئه‌كرایه‌ سه‌ر ،هچی نه‌مافی مرۆڤ هاته‌ ده‌نگو نه‌ ئه‌وانه‌شی ده‌ستیان سور بوو به‌ خوێنی موسڵمانان ناونران تیرۆریست ته‌نها له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ موسڵمانیان ئه‌كوشت په‌رده‌پۆشی كاره‌ كه‌یان كراو دره‌نگانێك وڵاتان به‌ ئاگا هاتنه‌وه‌ كاتێك خوێنی موسڵمان وه‌كو لاڤاو به‌نێو شه‌قام وكۆڵانه‌كانی بۆسنه‌دا جۆگه‌له‌ی به‌ست بوو، به‌ جۆرێك به‌درێژایی یه‌ك كیلۆمه‌تر یانزه‌ گۆڕی به‌ كۆمه‌ڵ دۆزرایه‌وه‌ !!!!!!

۱-به‌درێژای ئه‌و چوارساڵه‌ ۲۰۰۰۰۰ كه‌س شه‌هید كرا.

۲-۵۰۰۰۰ كه‌س بێ سه‌رو شوێن بوو.

٣- ٣٠٠٠٠ ئافرەت و له نێوان ٦ ساڵ بۆ ٨٠ ساڵ دەستدرێژی سێکسی کرایە سەریان.

٤- ٦٥٠ مزگەوت ڕوخێنرا.

٥- بە هەزارەهایان خاك و ماڵی خۆیان جێهێلاً ولەژیانێکی پڕ لەناڕەحەتی و ناهەمواری دا ژیانیان بەسەر ئەبرد.

**سەرکردە و بیرمەندوو موجاهیدی گەورە عەلی عیزەت بیگۆڤیچ:**

-سەرکردەی موسڵمانانی بۆسنە سیاسەتمەدارو نوسەر عەلی عیزەت بیگۆڤیچ لە ٨ ئابی ١٩٢٥ لە دایك بووە.

-لە ساڵی ١٩٦٢ بڕوانامەی بەدەستهێناوە لە یاسا.

دەستی کردوە بە کاری سیاسی لە پێناو سەربەخۆیی موسڵمان ولەو پێناوەدا قوربانی زۆری داوە چەند جارێك بەند کراوە و توشی ئەشکەنجەو لێدان بۆتەوە.

-لە ساڵی ١٩٨٩ حیزبی کاری دیموکراتی دامەزراند.

-لە ساڵی ١٩٩٠ بەشداری هەڵژاردنی کردو زۆرترین دەنگی بەدەست هێناو بوو بەیەکەم سەرۆکی موسڵمانی بۆسنە.

-خاوەن چەند کتێب ێکە لەوانە( البیان الاسلامی . عوائق النهضة الاسلامیة. الاسلام بین الشرق والغرب . هروبی الی الحریة)

ئەم کتێبانە بەچەند زمانێکی وەکو تورکی و عەرەبی و ئەڵمانی و ئینگلیزی و کوردی وەرگێڕاون.

-لە ١٩ تشرینی یەکەم ساڵی ٢٠٠٣ کۆچی دوایی کرد.

خاوەن چەند بڕاوانامەیەکی ڕێزلێنانی جیهانی یە لەوانە:

١- بڕوانامەی مەلیك فەیسەل بۆ خزمەت کردنی ئیسلام لە ساڵی ١٩٩٣ وەرگرت.

٢- بڕوانامەی بیرمەندی ساڵ له لایەن دەزگای عوسمان و عەلی له ساڵی ١٩٩٦ وەرگرت.

٣- بڕوانامەی بەرگری له دیموکراتی لەلایەن مەڵبەندی ئەمەریکی بۆ بەرگری له دیموکراتی وبیرو ڕای ئازاد وەرگرت.

٤- بڕوانامەی مەولانا جەلالە دینی ڕۆمی بۆ بەرگری له ئاینی ئیسلام له تورکیا وەرگرت.

هەریەکە لە زمانەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی وئەڵمانی و زمانی یوگسلاڤی ئەزانی.

# ئازاری موسڵمانان لە بولگارییا

بولگارییا یەکێکە لە وڵاتەکانی کیشوەری ئەورووپا کەدەوورە دراوە بەم وڵاتانە:

لەباکورەوە ڕۆمانیا لە ڕۆژئاواوە صربیا و جەبەل ئەسوەدو مەکدۆنیا لەباشورەوە یۆنان و تورکیالە رۆژهەڵاتی یەوە دەریای ڕەش.

ڕووبەری خاکەکەی :١١٠٩١٠کلم

ژمارەی دانیشتوانی :٧٢٦٢٦٧٥ ملیۆن کەسە

پایتەخت :صۆفیا

شارە گرنگەکانی :بلۆفدیف . فارنا . ڕوسی بورجاس .ستارا زاجۆرا. بلیفن

زمان : بولغاری و تورکی و ڕۆمانی

ئاین : مەسیحی ئەرسەدۆکسی لە٦، ٨٢٪

موسڵمان: ١٢,٢٪

ئاینی تر:٢، ١٪

سامانی سروشتی بۆکسیات و مس وقورقوشم و ئاسن و زینك ....هتد

## ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی بولگارییا

بولگاریەکان یەکێکن لە گەلە توندو تیژەکان ولەناوچەی ئۆراڵ ئەژیان کە بەشێك بوو لە خاکی یەکێتی سۆڤیەتی جاران لەنزیك ڕووباری فولجا دواتر ئەو ناوچە بەجێدەهێڵن و ئەپەڕنەوە بۆ نیوە دوورگەی

بەڵقان لە سەدەی حەوتەمی زاینی دالە باکوری ڕووباری دانووب نیشتەجێ ئەبن و ئێستا ئەو ناوچەیە بە بولگارییا ناسراوە.

دامەزراندنی یەکەم دەوڵەتی بولگاری لە ساڵی ٦٧٥ زاینی بۆ ١٠١٨ زاینی بوو.

دووەم دامەزراندنەوەی دەوڵەتی بولگاری لەساڵی ١١٨٧ زاینی بۆ ١٣٩٣ بوو دواتر بە هۆی فتوحاتی دەوڵەتی عوسمانی یەوە ڕووخاو بۆ ماوەی ٥ سەدە لەژێر دەسەڵاتی حوکمی ئیسلامی عوسمانییەکان مایەوە.

عوسمانییەکان لە ساڵی ١٣٤٥ زاینی لە ئاسیای بچوك (تورکیای ئێستا) وە پەڕینەوە بۆ ئەوروپاو شاری (ئادرنە) یان کردە پایتەختی یەکەمیان لە ساڵی ١٣٦٠ زاینی .

دواتر بەرەو باکور چوون وشاری (تۆرنۆفۆ) یان ئازاد کرد کە ئەکەوێتە باکوری خۆرئاوای بولگارییاوە لە ساڵی ١٣٩٣ زاینی دوای سێ ساڵ بۆ ئازاد کردنی شاری (فایدن) کە لە باکوری خۆرئاوای بولگارییا یە هەڵمەتییان بردو ئەوێش ئازاد کرا.

عوسمانییەکان لەسەر فتوحات بەردەوام بوون وخاکی صربیایان لە ساڵی ١٣٨٩ فەتح کرد لە درێژەی فتوحاتی عوسمانییەکان سوپایان ڕوو کردە باکوری ڕووباری دانووب وفەتحی هەریەکە لە ڕۆمانیا وباکوری پۆڵەنداو بەشی هەرەزۆری خاکی مەجەڕو بەشێك لە نەمسایان کرد لەسەدەی حەڤدەی زاینی دا.

دوای پێنج سەدە ڕووس جاڕی شەڕی دا

لە ٢-٤- ١٨٧٧ ی زاینی ڕووسەکان بە بیانووی پارێزکاری کردن لە مەسیحی یە ئەرسەدۆکسیەکان شەڕیان ئالآندە دەوڵەتی عوسمانی.

عوسمانی یەکان لەم شەڕەدا توشی شکستێکی گەورە بوون ڕووسەکان توانیان سوپای عوسمانی بە جۆرێك بشکێنن تا نزیکی ئەستەنبوڵ لە ژێر چنگی عوسمانی یەکان دەر بکەن . دەوڵەتی بەریتانیا ترسی لێ نیشت کە ئەگەر دەوڵەتی بولگارییا سەربەخۆیی وەربگرێت ئەوا هێزی ڕوسەکان ناوچەکە زیاد ئەکات،ئەمەشی بە مەترسی ئەزانی بۆ دەوڵەتی بەریتانیا .

دواتر پەیماننامەی بەرلین ئیمزا کرا لە ساڵی ١٨٧٨زاینی سوپای ڕوسی لە ناوچە کەپاشەکشەی کردو بولگارییا دابەش کرا بۆ پێنج بەش.بەشێکی درایەوە بە دەوڵەتی عوسمانی خۆرئاوەکەی درا بە صربیا.بۆسنەو هەرسك درا بە مەجەڕو نەمسا.

لە دوای شکستی یەکجاری دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩٠٨ زاینی بولگارییا جاڕی سەربەخۆیی خۆی دا و بەشداری هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی کردو هاوپەیمان بوو لە گەڵ ئەڵمانیا.

لە ساڵی ١٩٤٦ زاینی شیوعییەکان ئیدارەو دەسەڵاتیان لە بولگاریا گرتە دەسەت کۆتا ئەندامی لیژنە مەرکەزی حیزبی شیوعی (زیفکۆڤ) بوو لە ساڵی ١٩٧٩زاینی هاتە سەر دەسەڵات لە ١٠ نۆفەمبەری ١٩٨٩ زاینی بەتەواوەتی دەسەڵاتی شیوعییەکان لە بولگارییا کۆتایی پێهات:

**ڕەگەزی موسڵمانان و شێوازی دابەش بوونیان**

نزیکەی دوملیۆن موسڵمان لە بولگارییا ئەژی. دابەش بوونی موسڵمانان لە بولگارییا لە سەر شێوەی ڕەگەز و گەل و نەتەوەی جیایە کە بەم شێوەی لای خوارەوەیە:

١-تورکە موسڵمانەکان . نزیکەی یەك ملیۆن کەسن لەناوچەکانی ڕۆژهەڵات و باکوری ڕۆژهەڵاتی بولگارییا ئەژین لە نزیك شاخی ڕۆدۆب

لە باشوری بولگارییا نزیك سنوری تورکیا نیشتەجیٚ بوون و بە زمانی تورکی و بولگاری قسە ئەکەن.
٢-موسڵمانی بولگاریی (بۆماك ) خەڵکی ڕەسەنی بولگاریان و لە سەدەی حەڤدەی زاینی موسڵمان بوون نزیکە ٧٠ هەزار کەس ئەبن لە ناوچە شاخاوییەکان ئەژین وەکو شاخی ڕۆدۆب و بەشێکی تریان لە ناوچەی (بەلفین و لۆفك ) ئەژین.

٣- موسڵمانە غەجەری یەکان نزیکەی ٤٠ هەزار کەس ئەبن بەتورکی و بولگاری قسە ئەکە بەشێکیان لە صۆفیای پایتەخت ئەژین لەگەڵ هەندیٚ ناوچەی تر وەکو بلۆفدیف . سیلفن . فایدن .لۆربیریك . ئەرمشار .دۆنا فتسی . پازلۆج . فارنا و بازارجیك.
٤- موسڵمانە مەقدۆنی یەکان: مەقدونییا ئێستا دابەش کراوە لە نێوان باکوری یونان و یوگیسلافیای پێشوو .
٥- موسڵمانانی تەتەر: ئەم بەشە لە موسڵمانانی بولگارییا لە هۆزی تەتەرن، کاتێك قەیسەری ڕوس ویستی لە ناویانبەرێت لە ساڵی ١٨٦٠ زاینی ئەوانیش هەڵهاتن بۆ بولگاریا نزیکەی پەنجا هەزار کەسێك ئەبن لە هەندێك ناوچەی گوندنشین لە باکوری ڕۆژهەڵات ئەژین نزیك کەنارەکانی دەریای ڕەش دابەش بوون وەکو بالکیك و کافارن.
جگە لەم هۆزو ڕەگەزە جیا یانەی موسڵمانان لە بولگارییا هەندێك لە جالیەی عەرەب لە پایتەختی بولگارییا ئەژین کە نزیکەی ٥ هەزار کەس ئەبن.

## دڵۆپێك له ئازاری موسڵمانان له بولگارییا

موسڵمانان لـه بولگارییا بـۆ مـاوەی پێـنج سـەدە حـوكمی بولگارییـان بەدەسـتەوە بـوو هـیچ كـات ئاینـه جیاوەزەكـانی نـاو وڵاتـی بولگارییـا هەسـتییان نــەكردووە كــه ئــەمان هــاوڵاتی پلــه دوون موســڵمانان ڕیـژەیان٦٠ ٪ پێـك ئەهێنا،بـەڵام دوای ڕووخـانی دەوڵـەتی عوسمـانی موسڵمانان توشی سەدەها جۆری ئەشكەنجه وكوشتن و بڕین بوونـەوە بـه جۆرێك كـه ئێـستا موسـڵمانان تـەنها لـه ٢٪ دانیـشتوان پێكـدێنن و لەوپەڕی خراپی دا ژیان ئەگوزەرێنن،ئەوەشی له خـوارەوە ئامـاژەی پـێ ئەكەین دڵۆپێكه له ئۆقیانوسی ئازاری موسڵمانانی بولگارییا:

١–ڕق لێبونەوە لـه موسڵمانان بەهۆی ڕابردوویانـەوە:عوسمـانی یـەكان نزیكەی پێنج سەدە حوكمی ئەو ناوچەیان كردوە، بۆیـه هەرشتێك لـەو ماوە دوورو درێـژە ڕوویـدابێت ئێـستا بـەزیادەوە بەرامبـەر موسـڵمانان ئەیكەن بەجۆرێك ئەیانەوێت هەقی كۆنیان لێ بكەنەوە.

٢– داخستنی مزگەوتەكان له بولگارییا نزیكەی ١٢٠٠ مزگـەوت هـەبوو سەرجەمیان داخران.

٣– قەدەغەكردنی ئاهەنگ و شەعائیرە ئیسلامییەكان له دوای ڕووخانی خەلافـەت بــه هــەموو جۆرێـك ڕیگــری لــه موســڵمانان ئــەكرێت لــه بەجێگەیانـدنی واجبـه دینـی یـەكانی وەكـو نوێـژ و زەكـات و گرتنـی ڕۆژوو.

٤–قەدەغەكردنی سوننەت كردنی منداڵ.

٥– قەدەغەكردنی هێنانی كتێبی ئیسلامی بۆ ناو وڵات.

٦-داخستنی سەرجەم خوێندنگە ئیسلامییەکانو ڕێگری لە فێرکردنی منداڵ لە زانستە ئیسلامی یەکان.

٧-هەڵمەتی تەنصیری کردن لە لایەن حکومەتەوە،بە جۆرێك لە نێوان ساڵی ١٩٤٧ بۆ ١٩٤٨( ١٥٠٠٠٠) هەزار موسڵمان کراون بە نەصرانی.

٨- گۆڕینی ناوی موسڵمانان: بەهەموو جۆرێك قەدەغەیە ناوی ئیسلامی بنرێت لە منداڵ هەڵمەتێك کرا بۆ گۆڕینی ناوی گەورەکان دواتر ناوی مردوەکانیشی گرتەوە،ناوی ئەوانیشیان گۆڕی.

٩- نزیکەی ١٥٠٠ کەس لە موسڵمانە تورکەکان کوژران کاتێك ڕازی نەبوون ناوەکانیان بگۆڕن. لە ساڵی ١٩٨٩ موسڵمانان ڕێپێوانێکی هێمانایەن ڕێکخست بۆ ڕاگرتنی هەڵمەتی گۆڕینی ناوەکانیان کە ئەمە ساناترین مافی مرۆڤە کەچی لەلایەن حکومەتی شیوعی یەوە بە فڕۆکەوزرێپۆش ڕووبەڕووی خۆپیشاندەران بوونەوە، بە سەدەها کەس لە موسڵمانان کوژراو بەهەزارەهایان ناچار کرا کە کۆچ بکەن تەنانەت ئەو کەسانەش کە بەشداری ڕێپێوانەکەیان نەکردبوو، ئەوانیش بێ بەش نەبوون لە ئەشکەنجە و کۆچ پێ کردنی بە زۆر تەنها لە بەر ئەوەی موسڵمان بوون ساناترین مافییان پێ ڕەوانە بین نین نزیکەی ٣٠٠ هەزار موسڵمانی بە ڕەگەز تورك لە ماوەی ٥ مانگ دا لە سەر خاکی خۆیان وەدەرنران کە ئەمەش گەورەترین دەرکردنی بە کۆمەڵ بوو لە ئەوروپا لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی ڕویدا بێت تەنانەت پۆلیسێك بە موسڵمانێکی وتبوو تۆ ئاینت جیاوازە زمانت جیاوازە ئیتر بۆ نا گەڕێتەوە بۆ تورکیا !

حیزبی شیوعی چی بەرامبەر موسڵمانانی بولگارییا کرد؟

حیزبی شیوعی بولگاری لـه ساڵی ١٩٤٤ زاینی تا ساڵی ١٩٨٩ زاینی حـوکمی بولگارییـایی کـرد بـه هـەموو شـێوەیەك دژی موسـڵمانان جوڵایەوە،ئەوەی له توانایدا بوو زۆر بەزیادەوە کردی، ئەم چەند خاڵەی خوارەوە تەنها له ماوەی ٤٥ ساڵ دەسەڵاتی حیزبی شیوعی بولگاری دا کرا بەرامبەر به موسڵمانان!!!

١- ڕوخـانی پەیمانگائیـسلامییەکانوخاپوور کردنـی مزگەوتـەکان لەسەرانسەری بولگارییا،بۆ وێنه لـه نزیـك کۆلێژی ئەنـدازیاری لـه صـۆفیای پایتـەخت شوێنەواری مزگـەوتێکی وێرانـەی لێ یه تـەنها دیوارەکانی ماوە به شوێنی میحرابه کەیدا ئەزانی که ئەمـه مزگـەوت بووە له شاری بەلفین کـه ١٢ مزگـەوتی زۆر گـەورەی تێدابوو ئێستا تەنها مزگەوتێکی زۆر بچکۆلانەی تێدا ماوە.

٢- گۆڕینی مزگەوتەکان: یـەکێکی تـر لـه سیاسـەته چەوتەکانی حیزبی شیوعی، گـۆڕینی مزگەوتەکانـه بـۆ مۆزەخانـەو چێشتخانەو یانـەی خواردنـەوەو سـەما کردن،بـۆ وێنـه مزگـەوتی گـەورەی صـۆفیا کـه گەورەترین مزگەوتی بولگاریا بوو یاخود مزگـەوتی ستارازا کـورا و چەندەها مزگەوتی ترگۆڕاوون بۆیانەو مۆزەخانه!

٣- سوتاندنی زۆرێك لـه مزگەوتـەکان وەکو مزگـەوتی مانۆلیك لـه نزیـك شاری برغاس و مزگەوتی هاسکۆفۆ ...هتد

٤- داخستنی مزگەوتەکان و قەدەغه کردنـی هـەموو جۆرێکی پەرستش تێدا یاخود گۆڕینی بۆ تەوالێت !!!

٥- داخستنی سەرجەم قوتابخانەو پەیمانگا و کۆلێژه ئیسلامی یەکان.

٦- قەدەغـەکردنی موسـڵمانان لـە جـێ بـەجێ گەیانـدنی پەرسـتـشە ئیسلامی یەکان.

٧- نەهێـشتنی ژن هێنـان و شـووکردنی بـەپێی یاسـای ئیـسلام و زۆر کردن لە لاوانی موسڵمان تا بەشێوەیەکی ناشەرعی ئاهەنگ بگێڕن.

٨- گـۆڕینی نـاوی ئیـسلامی لـە سـاڵی ١٩٥٩ بڕیـار دەرکـرا بە یاسایی ئیبریل ناسرا، لـەم یاسـایەدا هـاتووە کە ئەبێت نـاوی موسـڵمانەکان بگۆڕێت لە ساڵی ١٩٦٢ ئەم یاسایە جێ بە جێ کرا لـە ساڵی ١٩٧٢ نـاوی موسـڵمانە غەجـەری یـەکان گـۆڕا و لـە سـاڵی ١٩٨٢ نـاوی موسـڵمانەکانی بولگارییـا بۆمـاك گـۆڕا و لـە سـاڵی ١٩٨٤ نـاوی موسڵمانە تورکەکان گۆڕا تەنانەت ناوی مردووەکانیشیان گۆڕی !!!

٩- بەهەموو جۆرێك لەسـەر موسڵمانایان قەدەغە کـرد کتێبـی ئاینییـان دەسـت بکـەوێت و دەسـتیان گـرت بەسـەر سـەجەم کتێبـە ئـاینی یەکاندا و زۆربەی کتێبە ئاینی یەکانیان لە ناو برد.

١٠- قەدەغە کردنی پەروەردە کردن منداڵ بە پەروەردەیـەکی ئـاینی و قەدەغەکردنی فێربوونی زمانی عەرەبی تا شارەزا نەبن لە قورئان.

١١- قەدەغە کردنی زمانی تورکی لە موسڵمانە تورکەکان.

١٢- قەدەغە کردنی سوننەت کردنی منداڵ.

١٣- قەدەغـەکردنی سـەرپۆش و بـاڵا پۆشـی ئافرەتـان و سـزادانی هـەر ئافرەتێك کە لەچك بکاتە سەری.

١٤- ڕێگری لـە بەڕۆژوو بوون لـە مـانگی پیرۆزی ڕەمـەزان دا و سزادانی هـەر کەسێك ئەگـەر پـێ ی بزانن کە بەڕۆژوو بـوو ئەگـەر فەرمانبەر بووایە یەکسەر لەسەر کارەکەی دەر ئەکرا.

١٥_ڕێگـــری لـــه ناشـــتنی مردوەکانیـــان لـــه گۆڕســـتانی تایبـــەت بەخۆیان،بـەڵکو دەبوایـە لـە گۆڕسـتانی مەسـیحی و مولحیـدەکان مردووەکانیان بنێژن.

١٣- قەدەغـەکردنی گێڕانـی ئاهـەنگ و بۆنـە ئیـسلامییەکانوەکو جەژنی ڕەمەزان وجەژنی قوربان و قەدەغەکردنی قوربانی کردن.

## سیاسەتی هەژارکردنی موسڵمانان

حیزبـی شـیوعی فـەرمانڕەوا لـە بولگارییـا هـەموو سیاسـەتێکی بـەکار ئـەهێنا دژی موسـڵمانان،وەکو بێکـار کردنیـان و قەدەغـەکردنیان لـە خزمەتی سەربازی و برسێتی و هـەژاری نـەزانی و نەخوێنـدەواری تێدا بڵاوکردبوونەوە. بۆ وێنە موسڵمانی غەجەر لە کۆمەڵگا زۆر چڕوپڕەکان نیـشتەجێ کـرا بوون،جگـــە لـــەوە هـــیچ خزمەتگوزاریـــەکی تێـــدا نەبوو،زۆربـەی خانوەکانیـان سـەقفەکەی لـەدار دروسـت کـراوە جگـە لـەوەی زۆربـەیان دوو خێـزان یـاخوود سـێ خێـزان لـە یـەك خـانوودا نیشتەجێ بوون، جگە لە لە نەبوونی خزمـەتگوزاریی و ئاو ئاوەڕۆ لە زۆربەی کۆڵانەکانیاندا. ٦٠٠٠لـە موسـڵمانە غەجـەری یـەکان بـێ ئاوی خواردنەوە بوون و خۆیان هەستان بەڕاکێشانی ئاو بۆ خۆیان ئەمـەو لـە نزیکـەی ١١٠٠ مـاڵی غەجـەری تـەنها ٥ تەلـەفۆن یـان هەیـە زیـاتر لـە نیوەیان تەمەنیان لە نزیکەی ١٦ ساڵەی هێشتا قۆناغی سـەرەتایی یان تەواو نەکردووە و لـە٣٠ ٪ یان نـە خوێنـدەوارن. موسـڵمانەکان بـە هـیچ

جۆرێك پلەی سەربازییان پێ نادرێت و زۆربەیان ئیش و كاری قورس یان پێ ئەكرێت لە كاتی خزمەتی سەربازی دا.
لە شاری (بازارجك) نزیكەی ٢٧٠٠٠ هەزار غەجەری موسڵمان ئەژین كەچی یەك مزگەوت یان نی یەو زۆر بەیان تەنها ئەڵێن موسڵمانین ئەگینا هیچ لە بارەی ئیسلامەوە نازانن،بەڵكو حكومەت لەو گەڕەكەدا كڵێسایەكی دروست كردوە كە تەنها تاكە مەسیحی یەكی تێدا نیشتەجێ نی یە.

## دوای شكستی شیوعییەت ئاهێك بەبەری موسڵماناندا هاتەوە

لەمانگی نۆفەمبەری ساڵی ١٩٨٩ زاینی دەسەڵاتی شیوعییەتلە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا كەوتە بەر شاڵاوێكی توندو لە ناوبرا. بولگارییا یەكێك لەو وڵاتانەبوو كە لە دەست دەسەڵاتی شیوعییەترزگاری بوو. خەڵكی بولگارییا ئاهێك هاتەوە بەبەریانداولە تاریكستانەی كە حیزبی شیوعی دروستی كردبوو ڕزگاریان بوو. هەڵبژاردن كرا و هێزە هاوپەیمانە دیموكراتی خوازەكان سەركەوتن و دەستوری وڵاتیان گۆڕی و داوای كرانەوە دیموكراتی زیاتر كراو هەوڵی بڵاوكردنەوی ئازادی و سەربەستی بیروڕاو پەرستشیان دا . بولگارییا زیاتر بەرەو كرانەوە چوو، موسڵمانانیش بارودۆخییان بەرەو باشتر چوو مافە دزاروەكانیان بۆ گەڕایەوە.
زۆرێك لەوانەی ئاوارەی وڵاتان بوون گەڕانەوەو ماڵ و موڵك وسامانی داگیر كراویان دەست كەوتەوە . موسڵمانان ئێستا بە هۆی بێ كەسی یانەوە تەنها ئەوەندەیان لە مافی دزراویان دەست كەوتەوە،بەڵام ئەگەر

هاوكاری و كۆمەكیان پێ بگات لەلایەن موسڵمانانی دەرەوەو ئەوا ئەتوانن لەسەر پێی خۆیان بوەستن،چونكە ئەوان زەمەنێكی توولانی سیاسەتی قڕ كردن و برسێتی و نەزانی و نەخوێندەواری و هەژاری و نەداری و هەوڵی بە نەصرانی كردن درا بەرامبەریان.

بۆیە ئێستا بەتەنها خۆیان ناتوانن هەستانەوە ئەگەر موسڵمانان كۆمەكیان بكەن تا ئەكەونەوە سەر باری ئاسایی خۆیان.

## ئێستا موسڵمانانی بولگارییا ئەم گرفتانەیان هەیە:

١- بێكاری: زۆربەی موسڵمانان لە بولگارییا بەدەست بێكاریەوە ئەناڵێنن،بەجۆرێك رێژەی بێكاری تیاندا ٨ ٪ و پاشەكەوتی تاكەكەس ٥ دۆلارە لە مانگێك دا،كە ئەمەش لە چاو ئاستی بژێوی لە بولگارییا زۆر نزمە.

٢-نەخوێندەواری: حیزبی شیوعی دەسەلآتدار بە سیاسەتە چەوتەكەی،رێگرییەكی زۆری كرد لە فێربوونی نەوەی موسڵمانان لەسەر فێربوونی خوێندن و نوسین و شارەزا بوون لەسەر ئاینەكەیان و بەهەموو جۆرێك زمانی عەرەبی لێ قەدەغە كرد بوون. بۆیان نەبوو فێر بین تا شارەزا نەبن لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و دەرگای هەموو خوێندنگە و پەیمانگاو زانكۆ ئیسلامی یەكانی داخست تا نەزانی لە ناو موسڵمانان بلاوبێتەوە.

# ئازاری موسڵمانان له تەراقیا

ئەکەوێتە باشوری ڕۆژهەلاتی بەڵقان و سێ دەریا دەوری داوە ئەوانیش دەریای ڕەش و دەریای ئیجەو دەریای مەڕمەڕە.
پایتەخت :کۆمۆنیتی
ڕووبەری خاکەکەی: ١٤١٥٧کیلۆمەترە
ئاین: ئاینی ڕەسمی مەسیحی یە
ژمارەی دانیشتوان: ٦٢٣٢٤٨کەسە
ژمارەی موسڵمانەکان– ١٥: هەزار کەسە
مزگەوت و شوێنی نوێژکردن :٣٠٠ دانە
کۆمەڵەو ڕێکخراوی ئیسلامی و قوتابخانە و پەیمانگا : ٢٦٠ دانە

ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی تەراقیا:

مێژووی تەراقیا،پەیوەستە بەمێژووی یۆنانەوە،بەپێ ی سەرچاوە مێژوویی یە کان ئەگەڕێتەوە بۆ ٣٠٠٠ پ .ز لەسەردەمی ئیغریقی یەکان وئیمپراتۆریەتی بیزنتی و ڕۆمای کۆن.
لەسەردەمی عوسمانی یەکان،قوستەنتینی یە لەساڵی ١٤٥٣ زایینی پایتەختی بێزەنتەکانیان فەتح کرد و کردیانە پایتەختی خۆیان.
عوسمانی یەکان ئازادیەکی تەواویان دابوو بە مەسیحی یەکان و مافی خۆبەڕیوبردنیان هەبوو،بەلآم یونانی یەکان حەزیان بەسەربەخۆیی ئەکردو زۆربەپەرۆشی هەوڵیان بۆ ئەدا.
لەساڵی ١٨١٤ زایینی بازرگانێکی یۆنانی کەلە ڕوسیا ئەژیا بەناوی (ئۆدیسا) کۆمەڵەی (الصداقة) ی دامەزراند و،لەڕێگەی ئەم کومەڵەیەوە

بزووتنەوەیەکی دژی داگیرکاری عوسمانی یەکان دروست کرد هەموو یۆنانی یەکانی ڕێکخست دژ به عوسمانی یەکان.

لەساڵێ ١٨٢١ یۆنانی یەکان شەڕیان دژ بەعوسمانی یەکان ڕاگەیاند و توانیان زۆرێك لەخاکی یۆنان له عوسمانی یەکان بسێننەوە. لەساڵێ ١٨٢٥ عوسمانی یەکان بەهاوکاری سوپای میسر توانیان باکوری یۆنان و ئەو ناوچانەی که لەلایەن یۆنانی یەکانەوە لێ یان سەندرابووە بیگرنەوە.

لەساڵی ١٨٢٧ زایینی هەریەکە لەڕوسیاو فەرەنسا و بەریتانیا ڕێکەوتن که کۆتایی به کێشەی عوسمانی یەکان و یۆنانی یەکان بێنن. سوپایان ڕێکخست و توانیان کەشتی گەلی میسری و عوسمانی یەکان تێکبشکێنن له شەڕی (نافارینو)و دواتر ڕوسەکان شەڕیان ڕاگەیاند لە گەڵ عوسمانی یەکان و لەساڵی ١٨٢٨ زایینی عوسمانی یەکان خاکی یۆنانیان بەجێهێشت و لەو بەروارەوە لەساڵی ١٨٢٩ زایینی یۆنان سەربەخۆیی وەرگرت.

لەپەیماننامەی بەریتانیا لەساڵی ١٨٣٠ زایینی هەریەکەلە فەرەنسا وڕوسیاوبەریتانیا دانیان نا بەسەربەخۆی یۆنان و پەیمانی پاراستنیان دا.لەساڵی ١٨٣٢زایینی (ئۆتۆ لیکۆن) بوو بەیەکەم پادشای یۆنان.

سنوری دەوڵەتی یۆنان دیاری کرا و ژمارەی دانیشتوانی لەو کاتەدا ٨٠٠ هەزار کەس بوو ڕووبەری خاکەکەی نیوەی ئەوەی ئێستا بوو نزیکه سێ ملیۆن یۆنانی لەژێر دەستی تورکەکان دا بوو،نزیکه ٢٠٠ هەزار یۆنانی له دورگەیەك دا بوون کەبەدەست بەریتانی یەکانەوە بوو. لەساڵی١٨٦٤ زایینی یۆنانی یەکان شەڕیان دژی تورکەکان بەرپا کرد و توانیان هەرێمی سیسالی و ناوچەی ئەرتای باشور ئیبروس

داگیربکەن.ئەم ناوچەیە هەمیشە ئەکەوتە بەر پەلاماری ئەو ولآتانەی کە هاوسنوری بوون. لەدوای شەڕی بەلقان تورکیا دەستی گرت بەسەر ڕۆژهەلآتی تەراقیا و بولگاریاش دەستی گرت بەسەر خۆرئاوای تەراقیادا.

لەشەڕی یەکەمی جیهانی،یونانییەکان ئەو بەشەی کە بەدەست بولگاریاوە بوو لێیان سەندەوە.بەشی ڕۆژهەلآتی تەراقیا لە سالی ١٩٢٣ گەڕایەوە بۆ تورکیا.

لەشەڕی دووەمی جیهانی و لە سالی ١٩٤١ بولگاریا بەشە یونانی یەکەی داگیر کرد،بەلآم لەسالی ١٩٤٤ گەڕایەوە بۆ سنوری سالی ١٩٤١. ئەم ناوچەیە تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی سەر بە تورکیا بوو لە دوای کۆتایی ئەو جەنگە ئەم ناوچەیە یۆنان داگیری کرد.

ئاینی ئیسلام کەی گەیشتە تەراقیا؟

لەسەردەمی ئومەوی یەکان دورگەکانی یۆنان لەلایەن موسلمانەکانەوە فەتح کرا،هەر لەسەردەمی ئەمەوی یەکان بوو ناوچەی ڕودس و ئەلەندلیسون کریت لە سالی ٢١٢ کۆچی فەتح کراو لەسەردەمی خەلیفەی عوسمانی مورادی یەکەم لەسالی ٧٨٢ کۆچی مەقدۆنیاش فەتح کرا.

بەهۆی ئەو چەند سەدەیەی کە عوسمانی یەکان دەسەلآتییان بەدەستەوە بووە زۆرێك لە موسلمانەتورك و ئەلبانی و بەلقانی یەکان هاتونەتە ئەم ناوچەیە ژیاون وبەهۆی تێکەلی موسلمانەکانەوە کۆمەلێك لە یۆنانی یەکان موسلمان بوون.

لە سالی ١٩٢٣ زایینی و دوای پەیماننامەی لۆزان یۆنانی یەکان موسلمانە ئەلبانیەکانیان لە ناوچەی جنینە دەرکردوموسلمانە

مەقدۆنێکانیـشیان دەرکرد،بۆیـە زۆربـەیان ڕوویـان لـە تورکیـا کـردو بەئاوارەیی لە تورکیا ژیان کە ژمارەی ئەو موسڵمانە دەرکراوانە گەشتە ۱۲۰۰۰۰۰ کەس.ئەوەش ئاوارە نەبوو بوو لە ژیانێکی پڕ لە ناڕەحەتی و ئازارو ئەشکەنجەو سوکایەتی دا ئەژیان کە زۆربەیان لەتەراقیای خۆرئاوا بوون کە ئەکەوێتە باکوری یۆنان .

بەهۆی ئەو سیاسەتە پڕ لە ڕقو قینەی بەرامبەر موسڵمانان لەم ناوچە ئەگیرایە بەر ڕێژەی موسڵمانەکان لە زۆرینەوە بوونە کەمینە کەپێشتر لە٦٨٪ دانیشتوانی ئەو ناوچەیان پێك ئەهێنا لەدوای ئەو زوڵم و زۆرەی لێ یان کراو زۆربەیان دەرکران ڕێژەی موسڵمانەکان هاتە سەر٣,١٪و لە کۆی ٣٠٠ گوندی موسڵمانەکان تەنها ٤٠ گوند بەئاوەدانی مایەوە.

لە دوای ئەو ڕێکەوتننامەیەیی کە لە نێوان تورکیا و یۆنان لە ساڵی ١٩٢٤ مۆرکرا و بەڕێکەوتننامەی (المقاصة)،ناسراوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ موسڵمانان لەم ناوچەیە بەرەو کەمی ژمارەی لاوازی ئەچن،بەجۆرێك لە دوای ٨٠ ساڵ لەو ڕێکەوتننامەیە ٢٠٠ هەزار لە موسڵمانەکان لە یۆنانەوە ناچار کران بگەڕێنەوە بۆ تورکیا.

ئازاری موسڵمانان لەتەراقیا:

١- ڕێگری ئەکرێت لە بوونی هاتووچۆی ئازاد لەنێوان ناوچە جیاوازەکانی تەراقیا،تەنانەت ئەگەر لە ناوچەیەکەوە بتەوێت سەردانی ناوچەیەکی تر بکەیت،ئەبێت مۆڵەت وەربگریت و لەنیوەی شەودا ڕێگری هاتوو چۆ ئەکرێت هەتا کاتژمێر پێنجی بەیانی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە لەناو بازنەیەکی ٣٠ کیلۆمەتری داخرودا ژیان بەسەر ئەبەن.

٢- دان نەنان بە بوونی کەمینەیەکی موسڵمانی تورکی و ئینکاری کردنــی هــەبوونی ئــەم کەمینــە موســڵمانە،تەنانەت ســەرۆك وەزیرانــی یونـان لـە لێدوانێکدا ڕایگەیانـد موسـڵمانی یۆنـانی بوونی هەیە لە تەراقیایی خۆرئاوا،بەڵام بە هیچ جۆرێك بوونی تورکمان نی یە لە یۆنان دا.

٣- هـەر موسـڵمانێك هاوکاری ڕێکخراوە مـرۆڤ دۆسـتەکان بکات و زانیـاری یـان بداتێ،لەلایـەن پۆلیـسەوە توشـی گـرتن و ئـازارو ئەشکەنجەو لێپرسینەوە ئەبێتەوە.

٤- تەنگـەتاو کردنـی پـارێزە موسـڵمانەکان لەلایـەن پۆلیـسەوە بـە بیانووی جۆراو جۆرو هەرکات خۆیان ئارەزوو یان لێ بێت.

٥- بەرپرسـی بەشـی لێکۆڵینـەوە ڕاستەوخۆ فـەرمان دەرئـەکات بـۆ چاودیری خستنە سەر موسڵمانە تورکەکان.

٦- تەنگپێ هەڵچنینی کۆمەڵەو ڕێکخراوە نرۆییەکان کە کار لەسەر دەست درێژی مافی مرۆڤ ئەکەن و بەرگری لە مافی مرۆڤ ئەکەن و لەلایەن پۆلیسەوە ئاستەنگیان بۆ دروست ئەکرێت.

٧- هـەر موسـڵمانێك لەهـەر بنکەیـەکی پـۆلیس یاداشـتی نـاڕەزای تۆمــار بکات،لەلایــەن پۆلیــسەوە ئەکەوێتەبــەر لێــدان و ئەشکەنجەو ئازار.

٨- ڕێگــری لــە دروســتکردنی مزگــەوت و تــازە کردنــەوەی مزگەوتەکان و نەهێشتنی دروستکردنی مزگەوتی تازە.

٩- ڕێگری لە دانانی موفتی یەکی سەربەخۆ بۆ خۆیان.

١٠-نەبوونی سەربەخۆیی ئەوقافی موسڵمانان.

ڕێگری یه سیاسی یه‌کان و هه‌وڵی حکومه‌ت بۆ که‌مکردنه‌وه‌ی ڕێژه‌ی موسڵمانان:

١- له‌کاتی هه‌ڵبژاردنه‌کان به‌هه‌موو جۆرێك هاتۆچۆ له هه‌موو ناوچه‌کانی ته‌راقیاو یۆنان قه‌ده‌غه ئه‌کرێت.

٢- داخستنی سنوری ته‌راقیاو شاره‌کانی تری یۆنان بۆ ئه‌وه‌ی موسڵمانان به‌شدارنه‌بن له هه‌ڵبژاردن و ده‌نگ یان که‌م بێته‌وه.

٣- تێکه‌ڵکردنی هه‌زاره‌ها پۆلیسی یۆنان له‌کاتی هه‌ڵبژاردنه‌کان دا تاڕێژه‌ی ده‌نگی موسلمانان که‌م بکات.که‌مکردنه‌وه‌ی سندوقی ده‌نگدان و فه‌وتانی ده‌نگی موسڵمانه‌کان له کاتی هه‌ڵبژاردنه‌کان دا

# ئـــەمریکای لاتین

## موسڵمانانی بەڕازیل

بــەڕازیل،ولاٌتێکی گــەورەو فراوانــی کیـشوەری ئەمــەریکای باشـورەو پێنجەم ولاٌتی جیهانە بۆ گەورەیی و فراوانی خاکەکەی.

بەڕازیل دەورە دراوە بەم ولاٌتانە:

لـە بـاکورەوە گویانـا و سـورینام و گویانـای فەرەنسی و فـەنزوێلا لـە خۆرئـاواوە کۆلۆمبیـا و پـیرۆ لـە باشـورەوە پۆلیڤیـاو پـاراگوای و ئەرجەنتین و ئۆرگوای لە ڕۆژهەلاٌتەوە زەریای ئەتلەسی.

پایتەخت : بەڕازیلیا

ژمارەی دانیشتوان :١٨٦١١٢٨٠٠کەسە

ڕووبەری خاکەکەی :٨٥١١٩٦٥کیلۆمەترە

زمان :پرتوگالی یە و لە هەندێك شوێن زمانی ئیسپانی زمانی ڕەسمی یە لەولاٌتی بەڕازیل،خەڵکی بەڕازیل بە ١٨٠جۆر شێوە زار قسە دەکەن شێوە زاری توبی زمانی خەڵکەڕەسەنەکەیەتی.

ئاین :مەسیحی کاسۆلیکی

موسڵمان لە١ . ٥٪

ئاینی تر ١٪

ڕەگـەز : بەشـێوەیەکی سـەرەکی بـەڕازیل لـە سـێ ڕەگـەزی سـەرەکی پێکـدێت، ئـەوانیش ئـەوروپی و هینـدی یـە سـورەکان و ڕەش پێـستە ئەفریقی یەکانە.

ئەوروپییەکان ٥٤٪ پێکدێنن

ئەفریقییەکان ٣١٪

١٢٪ لەڕەگەزی تر

ئیتالییەکان . ٢٨ ملیۆنن و ئیسپانییەکان . ١٥ ملیۆنن . ئەڵمان . ١٢ ملیۆنن . پۆڵەندی .یەك ملیۆن .لوبنانی .٨ ملیۆن . سوری دوو ملیۆن و نیو . فەڵەستینی .١,٣ملیۆن.

یەکەم مزگەوت لە شاری ساوپاولۆ بەردی بناغەی دانرا لە ساڵی ١٩٤٨،بەڵام لە ساڵی ١٩٦٠ کرایەوە،

یەکەم خوێندنگەی ئیسلامی لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو لەناوچەی ڤیلا کارۆن کرایەوە.لە بەڕازیل ١٢٠ مزگەوت هەیە و ٦٠ مەڵبەندو بنکەی ئیسلامی تێدایە.

ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی بەڕازیل

بەڕازیل یەکێکە لەو وڵاتانەی کە کریستۆفەر کۆڵۆمبۆس دۆزیەوەی و دواتر پرتوگالییەکان بە لێشاو کۆچییان بۆ کرد.

دەستپێکی مێژووی بەڕازیل بەلەسێدارەدانی سەرۆکی وڵات جۆزییە داسیلیفای نۆکرانی لەساڵی ١٧٨٩ زایینی لەسێدارەدرا دەست پێ دەکات. هەرچەندە لێکۆڵەرەوان پێ یان وایە کە هاوڵاتیانی ڕەسەنی بەڕازیل بەر لە ٨٠٠٠ ساڵ پێش داگیرکاری یە ئەورووپی یەکان لەم وڵاتەدا ژیاون. هاوڵاتیانی ڕەسەنی بەڕازیل چەند جارێك ڕاپەڕین و شۆڕشیان دژی داگیرکەران کردووە.بەڕازیل جگە لە پرتوگالییەکان وڵاتانی تری ئەورووپی هەوڵی داگیرکردن یان داوە،بۆ وێنە فەرەنسا،بەڵام نەیانتوانی لە چنگی پرتووگالییەکانی دەربێنن.

هۆڵەنـدی یـەکان لـە سـاڵی ١٦٣٠- ١٦٤٧زایینـی شـەڕو کێـشمە کێشمیان بوو لە گەڵ پرتوگالییەکان،جگە لەوەی لە ناوخۆش خەڵکی ڕەسەنی بەڕازیل شەڕیان بوو لە گەڵ پرتوگالییەکان.

بـەڕازیل گـەورەترین وڵاتـی کیـشوەری ئەمـەریکای باشـووره بەدەسـت پرتوگالییەکانەوە بوو،بۆیە ناونرا ئەمەریکای پورتوگالی.

لـەنزیکی کۆتـای سـەدەی پانزەهـەمی زایینـی لەسـاڵی ١٤٩٤ ڕێکەوتننامەیەك لە نێوانێ ئیسپانی و پورتوگالییـەکان مۆرکراو ئەو بەشەی کەوا ئێستا پیێ ی ئەوترێ بەڕازیل درا بە پرتوگالییـەکان باقی بەشەکەی تری ئەمـەریکا درا بە ئیسپانیا. شاری سانتۆی بەڕازیل بە کویلـە ئەفریقییـەکان دروسـت کـرا ملیۆنـەها کویلـە لـە سـاڵی ١٥٤٩ – ١٨٥٠ هێنرانە بەڕازیلەوە.

لەساڵی ١٨٨٨ شاری باهیا کەپایتەختی موستعمەرەی پرتوگالییـەکان بـوو پایتـەختیان گواسـتەوە بـۆ شـاری ڕیـودی جـانیرۆ دواتـر شـاری بـەرازیلیا کـرا بـە پایتـەخت. لـە سـاڵی ١٨٨٩ زاینـی بـەڕازیل جـاڕی سەربەخۆییدا.

## ئاینی ئیسلام وڵاتی بەڕازیل

سەرچاوە مێژووییەکان،ئەوە دڵنیا ئەکەنەوە کە ئاینی ئیسلام بەر لە کۆڵۆمبس لە بەڕازیل هەبووە.

کەشـتی کـابرال لـە کـەناراوەکانی بـەڕازیل لەنگـەری گـرت و چـەند کەسایەتیەکی موسڵمانی لە سەر پشت بوو،لەوانە شەهابەدینی کوڕی ماجد و موسای کوڕی ساتع.

مێژوونوسـی بـەناوبانگی بـەڕازیل(جـواکین هـیرۆ) لـە یـەکێك لـە موحازەرەکانی لـە سـاڵی ١٩٥٨ کـە ئـەم موحـازەرەی لـە ڕۆژنامـەکانی

بەڕازیل بڵاووبوویەوە،ئەڵێت بەر لەهاتنی پورتوگالەکان موسڵمانەکان هاتونەتە بەڕازیل لەساڵی ١٥٠٠ زایینی،تەنانەت ئەڵێت کاتێك پرتوگالی یەکان هاتن زۆربەی کەشتیوانەکانیان موسڵمان بوون.

موسڵمانانی بەرازیل باس لەوە ئەکەن کەباوباپیرانیان لە ساڵی ١١٥٠زایینی لە ئەندەلوسەوە بەزەریای ئەتڵەسی دا هاتونەتە بەڕازیل.لە کتێبی (العرب فی امریکا) دا نوسەرەکەی ئەڵێت مارکۆس دی نایز. ئەو ناوچانەی دۆزیوە کە کەئەمڕۆ بە نیومەکسیکۆ و ئەریزۆنا ناسراوە لە ساڵی ١٥٣٩ زایینی ڕێبەرەکەی موسڵمانێکی مەغریبی بوو بەناوی ئەستەفان. جگە لەوەی کاتێك ئەندەلوس ڕووخا موسڵمانەکان لەترسی دادگای پشکنین هەڵهاتن بۆ بەڕازیل.

ئەگەر سەرنج بدەیت لە ویلایەتی باهیا یاخودشاری سالفادۆر ورسیف و ریودیی جانیرۆ بە ئاشکرا جێدەستی بیناسازی ئیسلامی ئەبینیت لەسەر نەخشی دەرگاو پەنجەرەو باخچەو فەوارەی ئاوو کۆڵانە بەبەرد وشۆستە کراوەکانی وەکو پیاسە بکەی بە کۆڵانێکی شاری فاس یاخود هەر شارێکی تری ئیسلامی دا پیاسە بکەی ئەو شارانەی کەلەسەرەوە ناومان هێنان لە ٨٠٪ خەڵکە کەی بریتی یە لە تێکەڵەی موسڵمانە ئەفریقییەکان،چونکە لەسەردەمی داگیرکاری پروتوگالی یەکان بەلێشاو کۆیلەیان ئەهێنا بۆ بەڕازیل کە زۆربەیان موسڵمان بوون.

لەساڵی ١٥٣٨ زایینی تا ٤٠ ساڵ لەو بەرورارە بە دواوە ١٤ هەزار کۆیلەی موسڵمانیان هێنا بۆ بەڕازیل

دواتر ٦٠٠٠٠٠ کۆیلەی ڕەش پێستیان لە ڕۆژئاوای کیشوەری ئەفریقاوە هێنا لەسەر پشتی کەشتی یەك کە هەمووکۆیلەکا نیان بە

زنجیر بەست بووە زۆربەیان مردن و هەندێکییان کەنەخۆش کەوتن فڕێیان دانە ناو زەریاوە.

کۆیلە موسڵمانەکان سەرەڕای ئەو زوڵم و زۆرەی لێ یان ئەکرا پابەند بوون بەئاینی و زمان و نەریتی خۆیانەوە.کۆیلەکان هەستان بەچەند شۆڕشێك لە ساڵەکانی ١٨٠٥ -١٨١٣-١٨١٦-١٨٢٦- ١٨٢٧- ١٨٢٩ ،بەڵام ڕێکخراوترین شۆڕش شۆڕشی مالیز یاخود مالی بوو لە ویلایەتی باهیا لە ساڵی ١٨٣٥ بەسەرکردایەتی شێخ ئەلهاوسا،بەڵام دەسەڵاتداران زووتر هاتنە دەست و دەستیان کرد بە ڕەش بگیری کویلەکان ۆ نەیانهێشت ئەوانەی لە گوندەکانەوە بۆ پاڵپشتی شۆڕشەکە هاتبوون بگەنە شارەکان و زووتر دەسگیرکران. دواتر لە دادگایەکدا حوکمی ئەوانە دڕا کە شۆڕشەکەیان ڕێکخست بوو ٢٨٦ پیاوو ٢٤ ئافرەت،سزاکانیش لە سێدارەدان و بەندی هەتا هەتایی و جەڵد لێدانی تێدا بوو.

سەرەڕای شکستی زۆربەی شۆڕشی موسڵمانەکان،تا ئێستا نەوەکانیان پابەندن بە ئاینی ئیسلامەوەو بەدوورن لە ئارەق خواردنەوە و تەنانەت بۆ ڕۆژانی هەینی بە پۆشاکی سپی یەوە ئەچن بۆ نوێژی هەینی و لەکاتی قوربانی دا قوربانی سەرئەبڕن.لەساڵی ١٨٨٨ زایینی یاسایی قەدەغەکردنی کۆیلە دەرچوو.هەرچەندە ئەم بڕیارە زۆر درەنگ دەرچوو،چونکە زۆرێك لەکۆیلەکان زمان و داب و نەریتیان گۆڕیبوو کەمێکیان وەکو خۆیان مابوونەوە و دەستیان گرتبوو بە ئاینەکەیانەوە.

لەدوای کۆتای جەنگی یەکەمی جیهانی بەدواوە،کاری بانگەوازی چووە قۆناغێکی نوێوە بەتایبەت لە ساڵی ١٩٢٦ یەکەم ڕێکخراوی خێرخوازی ئیسلامی دروست کرا.

یەكێك لەئامانجە گرنگەكانی ئەم ڕێكخراوە دروست كردنی مزگەوت بوو،یەكەم مزگەوتیش لەساڵێ ١٩٥٧ دروست كرا بەهۆی لاوازی باری ئابووری موسڵمانانەوە،جگە لەدروست كردنی مزگەوت ڕۆژنامەیەكیان لە ساڵی ١٩٣٣ دەرئەكردو لە ساڵی ١٩٣٧ ڕۆژنامەیەكی تریان دەركرد.لە سەرەتای حەفتاكانی سەدەی ڕابردوو یەكەم خوێندنگەی ئیسلامییان دامەزراند،دواتر ئەم ڕێكخراوە پارچە زەوی یەكیان وەرگرت كردیان بە گۆڕستان بۆ موسڵمانەكان.

لە ساڵی ١٩٧٩ بەهەوڵی سەفیری وڵاتە ئیسلامییەكان كە لە بەرازیل بوون بەسەرپەرشتی حاجی حسێن موحەمەد زوغبی دامەزراوەیەی كاری ئیسلامی دامەزرا كە كاری لەسەر هەموو مزگەوت وخویندنگەو بنكە ئیسلامییەكانئەكرد و هەوڵی پەروەردەكردنی نەوەیەكی نۆی ئەدا بەبەرنامەیەكی ئیسلامی گشتگیر.

لە ساڵی ١٩٨٦ مەڵبەندی بانگەوازی ئیسلامی لە ئەمەریكای لاتین دامەزراو كاری ئەكرد بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی و سەرپەرشتی مزگەوت و كاری بانگەوازی ئیسلامی و جگە لەوە سەرپەرشتی كاری بازرگانی ئیسلامی ئەكەن بە شێوەیەكی شەرعیانە،بەتایبەت لە بواری سەربڕینی ئاژەڵ وپەلەوەردا.

بانگەوازی ئیسلامی لەبەرازیل پێشواز ییەكی باشی لێكرا تەنها لە شاری ساوپاولۆ نزیكەی ١٠٠ بنكەی و مەڵبەندی ئیسلامی خەریكی كاری بانگەوازن.لە ساڵی ٢٠٠١ تا ٢٠٠٤ لەیەك بنكەی ئیسلامی لە شاری ساوپاولۆ ١٥٠٠ گەنج خۆیان ناونوس كردووە.

گرفتی موسڵمانان لە بەڕازیل:

وڵاتی بەڕازیل،یەکێکە لەو وڵاتانە ڕێگری لە ئازادی ئاینی ناکات،بۆیە گرفتی موسڵمانان جیایە لە گرفتی موسڵمانانی جیهان، ئێمە لەم چەند خاڵەدا بەکورتی ڕوونی ئەکەینەوە:

١- کەمی بانگخوازی ئیسلامی.

٢- گرفتی ئابوری :زۆربەی موسڵمانانی بەڕازیل هەژارن و تەنانەت زۆرێك لە مزگەوتەکان لەبەر نەبونی داخراوان و ناتوانن پارەی مامۆستاو ئیمامی مزگەوت دابین بکەن.

٣- لاوازی ڕاگەیاندن: موسڵمانانی بەڕازیل هیچ هۆکارێکی ڕاگەیاندنی بەهێزیان نی یە تا بتوانن بیکەنەپردی پەیوەندی ناوخۆی خۆیان یاخود بتوانن لەو ڕێگەیەوە خۆیان بەجیهانی دەرەوە بناسێنن.

٤- بونی هەڵمەتی بە گاوکردن.

٥- بوونی زۆرێك لە جولەکەو دروست کردنی گرفت بۆموسڵمانان کە لەلایەن باڵوێزخانەی ئیسرائیلەوە هان ئەدرێن.

٦- بێ ئاگابوونی وڵاتانی ئیسلامی لەموسڵمانانی بەرازیل.

٧- گرفتی نەبوونی خوێندنگەی ئیسلامی و پەرش و بڵاوی موسڵمانان.

٨- شارەزانەبوون لە ئیسلام: گرفتی بەشێکی زۆری موسڵمانانە کە زۆرێکیان تەنها بەناو ئەزانن ئیسلام هەیە و هیچ لە بارەیەوە نازانن.

٩- بوونی شیعەو دروست کردنی گرفت بۆ موسڵمانان و دروست کردنی بیدعەو خورافیات.

# ئازاری موسڵمانان له کوبا

**کوبا کەوتۆتە ناو زەریایی ئەتڵەسی**

**پایتەخت . هاڤانا**

**ڕووبەری خاکەکەی .١١٠٦٨٠ کیلۆمەترە**

**ژمارەی دانیشتوان . ١١٣٤٦٧٠٠ کەسە**

**سەرەتای گەشتنی ئاینی ئیسلام بە کوبا:**

زۆر بەوردی نازانرێت کەی ئاینی ئیسلام گەشتۆتە کوبا، بەڵام لە دەفتەری یاداشتەکانی کریستۆفەرکۆلۆمبس کە باسی یەکەم گەشتی ئەکات بۆ کوبا لە ساڵی ١٤٩٢ باس لە بوونی مزگەوت ئەکات لە سەریەکێك لە شاخەکانی کوبا کە بە عەرەبی لەسەردیوارەکەی نوسراو هەبووە.

جگە لەوەی کریستۆفەر یەکەم موستەعمەرە کە دروستی کرد بۆ هیندی یە سورەکان کاتێك خواردنەکانی بینین کەلە خواردنی موسڵمانەکان ئەچێت توشی سەرسوڕمان بوو.

هەڵبەت ڕای جیاواز هەیە گوایا دامەزرێنەری کەشتی گەلی عوسمانی یەکان چەند کەشتی یەك ئەنێرێت تا بزانێت چی هەیە لە پشت زەریای هێمنەوە ڕەنگە ئەوە سەرەتای گەشتنی موسڵمانان بێت بەم ناوچەیەو ڕای تر باس لەوە کەئەکەن دوو کەشتی لە ساڵی١٣٠٧بۆ ١٣٢٢ زاینی چوون بۆ دەرخستنی پشت زەریای هیچ کام یان نەگەڕانەوە.

هەڵبەت هاتنی ئیسپانەکان بۆ کوبا بۆ ئەوە بوو خاکەکەی داگیر بکەن و خەڵکەکەی بکەن بەمەسیحی، بۆیە لە گەڵ کریستۆفەر شەش کاهینیان

نارد تا خەڵكی بكەن بەمەسیحی.دواتر ئیسپانییەكان دەستیان كرد بە كوشتنی خەڵكی ڕەسەنی كوبا بەجۆرێك ئەو كات هیندی یە سورەكان ئەسپیان نەبینی بوو و زۆر لێ ی ئەترسان،كاتیك شەڕیان ئەكرد وایان ئەزانی سوارەی سەر ئەسپەكەو ئەسپەكە یەك كەسە بۆیە زۆر جار سەری ئەسپەكەیان ئەپەڕان و وازیان لە سوارەكە ئەهێناو كوشت وبڕینی هیندی یە سورەكان نزیكەی پەنجا ساڵی خایاند.

ئیسپانەكان نزیكەی ١٠ ملیۆن كۆیلەیان هێناتا ئەمەریكای باكورو ناوەڕاست ئاوەدان بكەنەوە ٣ملیۆن یان موسڵمان بوون.

## شۆڕشی شیوعی لە كوبا:

كاتێك فیدڵ كاسترۆ لە ساڵی ١٩٥٩ شۆڕشی كرد لەو ساتەوە موسڵمانان لە هەموو جۆرە پەیوەندیەك دابڕان بە جیهانی دەرەوە،جگە لەوەی بەهیچ جۆرێك موسڵمانەكان بۆیان نەبوو مزگەوت دروستبكەن و خودا پەرستی بكەن،تەنها یەك خانوو هەبوو لە هاڤانای پایتەخت لەڕۆژی هەینی دا بۆ ماوەی سێ كاتژمێر ئەكرێتەوە،ئەمە تەنها بەرامبەر بە موسڵمانەكان ئەكرێت لە كاتێك دا لە كوبا ١٣٠٠ جولەكە هەیە ١١ پەرستگایان هەیە.

جگە لەوەی موسڵمانەكان توشی هەڵمەتی بەمەسیحی كردن ئەبنەوە لەلایەن كۆمەڵەو ڕێكخراوە تەبشیری یەكانەوە.موسڵمانانی كوبا گرفتی نەبوونی سەربەستیان هەیە و، بەهەموو شێوەیەك دابڕاون لە جیهانی دەرەوەی خۆیان وهیچ كەس ئاگای لە حاڵی موسڵمانان نی یە لەم وڵاتە شیوعی یەدا.

## ئازاری موسڵمانان لە سۆڤیەتام:

سۆرینام ئەکەوێتە باکوری کیشوەری ئەمەریکای باشور لەسەر کەناری زەریـای ئەتڵەسـی یـەو دەورە دراوە بـەم وڵاتانـە لەڕۆژهەڵاتـەوەگۆیانای فەرەنـسی لـەڕۆژئاواوە گۆیانـای ئیـسپانی یەلەباشـورەوە بـەڕازیل و لەباکوەوە زەریای ئەتڵەسی یە

پایتەخت :پاراماریبۆ

ژمارەی دانیشتوان :٤٣٨١٠٠

ڕووبەری خاکەکەی :١٦٣٢٧٠ کیلۆمەترە

له ساڵی ٨٩٨ کۆچی واتا ساڵێك دوای ڕووخانی ئەنـدەلوس ئیـسپانی یـەکان ئـەم خاکـەیان ناسـی و بانگەشـەی ئـەوەیان کـرد گوایـە خـاکی ئیـسپانی یەکانـە و هـەر خاکێکیـان بوێـت بـەناوی نەصـرانی یەتـەوە ئەیانکرد بە موڵکی خۆیان.ئینگلیزو هۆڵەند یەکان چەند جارێك لەسـەر ئەم وڵاتە بۆتە کێشەیان،دواتر هۆڵەندیـەکان لـە سـاڵی ١٠٧٨ ی کۆچی خۆیان تیا دامەزراندو دوای داگیرکاری هۆڵەنـدی یـەکان وئینگلیزەکـان چـەند جارێـك ئـەم وڵاتـەیان داگـیر کردو،لەسـاڵی ١٣٧٤ ی کۆچـی سەربەخۆیی وەرگرت.

### هاتنی موسڵماننەکان بۆ سۆرینام:

هۆڵەندیەکان،کۆمـەڵێك کۆیلـەی ئـەفریقیان هێنـا بـۆ ئـاوەدان کردنـەوەی وڵات و کۆیلـەکانیان زۆر ئەچەوسـاندەوە و ئیـشی قـورس یـان پـێ ئـەکردن و مـاوەی کـارکردن یـان زۆر بـوو. کۆیلـە ئەفریقی یەکان یـاخی بوون لەتاو ئەوزوڵم وناهەقی یەی بەرامبەریان ئەکرا لـە ژێـر فەرمانـدەی سەرکردەیەکی موسڵمان پەنایان بردە بەردارستانەکان لـەوێوە دەستی یان کرد بەچالاکی (ئەم گروپە نـاوی جیوکابوو) بـەهۆی چالاکی یـەکان

یانەوە هۆڵەندی یەکان ناچار بوون دانوستان یان لەگەڵ بکەن لە ساڵی ١١٧٢ کۆچی و

هۆڵەندی یەکان ناچار بوون کرێکاری تر بێنن لە وڵاتی هیندو چین و ئەندەنوسیاوە بەمەش ڕێژەی موسڵمانەکان زیادی کرد چونکە ئەم کرێکارە تازانە زۆربەیان موسڵمان بوون

ڕێژەی موسڵمانەکان بوو بەلە ٤٠٪

هۆکاری زیاد بوونی موسڵمانان:

١-خەڵکانێکی زۆر موسڵمان ئەبوون وئەهاتنەناوئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە.

٢-زیاد بوونی ڕێژەی لەدایك بوون لەناو موسڵمانەکان.

٣- کۆچی خەڵکی بۆ دەرەوەی وڵات ئەوانەی کۆچیان ئەکرد لە موسڵمانەکان نەبوون،ئەمەش ڕێژەی موسڵمانەکانی زیاد ئەکرد.

حاڵی موسڵمانەکان:

دوای هێنانی کۆیلە ئەفریقی یەکان، ئەو زوڵم وزۆرەی لێ یان ئەکراو کاری قورسیان پێ ئەکراو هەژاری و نەخوێندەواری تیایاندا بڵاوبوویەوە.بەڵام بەهاتنی کرێکارە ئەندەنوسی و هیندی یەکان کە زۆربەیان موسڵمان بوون بوو بەهۆی ئەوەی کرێکارە ئەفریقی یەکان جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ باوەشی ئاینی پیرۆزی ئیسلام،کرێکارە هیندی و ئەندەنوسی یەکان دەستیان کرد بەکردنەوەی مزگەوت و دەنگی بانگیان لە سۆرینام بەرز کردەوە.

کرێکارە هیندیەکان کۆمەڵەیەکیان دروست کرد بەناوی کۆمەڵەی موسڵمانانی سۆرینام .موسڵمانە هیندیەکان هەموویان سونین و لەسەر مەزهەبی حەنەفین لەساڵی ١٣٧٥ کۆچی هەندێك مزگەوت و

قوتابخانــەی ئیــسلامیان دروســت کــرد و گۆڤارێکیــان دەرئــەکرد و زۆرچالاك بوون لـەبواری بـانگخوازی دا.موسـڵمانە ئەندەنوسـی یـەکان یـەکێتی ئیـسلامی سـۆرینام یـان دامەزراند،ئـەمانیش سـونی مەزهـەب بوون و لەسەر مەزهەبی شافیعی بوون.

## کێشەی موسڵمانانی سۆرینام:

موســڵمانانی ســۆرینام گرفــت و کێــشەکەیان لەنــەبوونی یــەکریزی موســڵمانەکان و بــوونی دەمــارگیری مەزهــەب گــەرایی یە،بــەجۆرێك پەرتــەوازەو نــاکۆکی خــستۆتە ناوموســڵمانان کەهەرکەســەو بــەلای مەزهـەبی خـۆی دا ڕایئەکێـشێت. بـوونی تەریقـەی قادیـانی کـەدزەیان کردۆتە ناو ڕیزی موسڵمانان و بەهەموو جۆرێك خەریکی دروستکردنی دوو بەرەکی وئاژاوەن لـەناو ڕیزی موسـڵمانان و جگەلەمـەش خـەریکی دروست کردنی بیدعەو خورافەن لەناو موسڵمانان دا .

# مسوڵمانانی ئــــەفریقیا

## ئازاری موسڵمانان له زامبیا

زامبیـا ئەکەوێتــه ناوەڕاسـتی کیـشوەری ئەفـەریقاو دەوره دراوه بـەم ولآتانه:

لەباکوری ڕۆژهەلآتی یەوه تەنزانیا له باکورەوه زائیرو ئەنگۆلا

لەڕۆژئاواوه مەغریب و مـەلاوی لەڕۆژهەلآتـەوه مۆزەمبیـق لەباشورەوه زیمبابۆی و بتسوناو ناميا

ڕووبەرەکەی : ٧٥٢٦١٤ کیللم

ژمارەی دانیشتوان : ١١٢٦٧٩٥ کەسه

پایتەخت : لۆکاسا

ژمارەی موسڵمانان :٥٦٣٠٨٩ کەسه

زمـان : ئینگلیـزی زمـانی فەرمییـه و هەنـدیٚ زمـانی تـریش هـەن وەکـو تونجا .نیانجا . لۆزی .بمبا

ئاوڕدانەوەیەك له مێژووی زامبیاو گەشتنی ئاینی ئیسلام به زامبیا:

ئـاینی پـیرۆزی ئیـسلام لەسـەدەی چـوارەمی کۆچـی گەشـته ناوەنـدی کیشورەی ئاسیا و دەستی بەبلآوبوونـەوه کـرد. لەسـەردەمی شیرازی یــەکان کاتێــك ئیمارەتێکیــان دامەزرانــد بــەناوی (ئیمــارەتی کــانوا) بانگـەوازی ئیسلامی بلآوبوویـەوه و گەیـشته مۆزەمبیق،دواتر بەهۆی تێکەڵی موسڵمانان له گەڵ خەڵکی ئەفەریقا ودروست بوونی ئاڵوگۆڕی بازرگـانی ئـاینی ئیـسلام گەیـشته مـەلاوی.موسڵمانەکان دەستیان کـرد

بەدروست کردنی مزگەوت بەدرێژای کەنارەکانی ئەفریقاو بەقووڵایی ئەفریقایا مزگەوتیان دروست کرد.

لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی زنج و لەسەردەمی عەمانییەکان بانگەوازی ئیسلامی زیاتر بڵاوبوویەوە،

بەم هۆیەشەوە ئاینی ئیسلام گەشتە زامبیا لەرێگەی وڵاتە دراوسێ کانی یەوە،وەکو تەنزانیا ومەلاوی و مۆزەمبیق.هەندێك لە هۆزە موسڵمانەکان کۆچیان کرد بۆ زامبیا جگە لەمان خەڵکی سۆماڵ و کینیا هاتنە زامبیاو نیشتەجێبوون ئەمەش زیاتر ئاینی ئیسلامی بڵاوو کردەوە لە زامبیا

لەکاتی داگیرکاری بەریتانییەکان بۆ زامبیا و بەتایبەت کاتێك ویستیان سکەی شەمەندەفەر ڕابکێشن لە باشوری ئەفریقاوە بۆ زیمبابۆی ئەو کرێکارانەی ئەو کارەیان ئەکرد خەڵکی هیندستان و پاکستان بوون و زۆربەیان موسڵمان بوون و خەریکی بانگەوازی ئیسلامی بوون.کۆمەڵێك کرێکاری سۆماڵی کاریان لە بۆریە نەوتی یەکانی نێوان دارسەلام و زامبیا ئەکردو هۆکاربوون بۆ زۆربوونی موسڵمانان لە زامبیا. جگە لەمانە کۆمەڵێك خەڵکی مەلاوی بوون کاری مسگەرییان ئەکرد ئەوانیش موسڵمان بوون،ئەمانە هۆکار بوون بۆ زۆر بوونی ڕێژەی موسڵمانان لە زامبیا، بۆیە ئەبینی زۆربەی ڕێژەی موسڵمانان لەم شارانەدا کۆبوونەتەوە (لوالوانشیا .وونـدولا .وکینوی .و مۆفیری . شنقولا .وشیلا .وتولوشی .و کابرلموشی.

دامەزراوە ئیسلامییەکان:

لە زامبیا کۆمەڵێك دامەزراوەی ئیسلامی هەیە کە کاریان ڕێکخستنی موسڵمانان و بانگەوازی ئیسلامی و سەرپەرشتی کردنی مزگەوت و شوێنە ئیسلامییەکانە،لەوانە:

١- کۆمەڵەی ئیسلامی سەرپەرشتی مزگەوتەکان ئەکات.

٢- کۆمەڵەی لاوانی موسڵمان زۆربەی ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە هیندی و پاکستانین.

٣- پەیوەندی ئافرەتانی موسڵمان.

٤- ناوەندی ئیسلامی لەپایتەخت لۆسۆکا.

جگە لەم کۆمەڵە ئیسلامییانە نزیکەی ١٩ ڕێکخراو کۆمەڵەی تری ئیسلامی هەیە لەزامبیا

ژمارەی مزگەوت لەزامبیا ئەگاتە ٦٧ مزگەوت.

خوێندن لای موسڵمانانی زامبیا

بەهۆی ئەوەی موسڵمانەکان کەمینەن و حکومەت دان بە مافەکانیاندا نانێت،خوێندن لەو وڵاتە زیاتر شارەزا بوونە لە مەسیحییەت،بۆیە موسڵمانەکان زۆربەیان منداڵەکانیان نانێرنە بەر خوێندنی حکومەت و ڕێژەی خوێندنگە ئیسلامییەکان کەمەو مەنهەجی خوێندنەکەشیان زۆر پێشکەوتوو نییەو لەهەندێك شوێن تەنها قورئان ئەخوێنریت و بەس.

ئەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی موسڵمانەکان ئەبێتەوە:

١- نەشارەزایی زۆرێك لە موسڵمانەکان لە هەندێك ناوچەدا.

٢- گۆڕینی بیرو باوەڕ.

٣- شوکردن و ژن هێنان لەگەڵ غەیرە موسڵمانەکان.

٤- هاتنی تاقمە تەبشیرییەکان بۆ بڵاو کردنەوەی ئاینی مەسیحی.

٥- زۆرو بۆری کۆمەڵەو ڕێکخراوە ئیسلامییەکان.
٦- بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری بەهۆی کەمی قوتابخانە.

ئەو کارانەی پێویستە موسڵمانانی زامبیا بیکەن:

١- بڵاوکردنەوەی خوێندەورای لەناو موسڵمانەکان.
٢- چاکردنەوەی مزگەوتەکان و دانانی مامۆستای باش تیایاندا.
٣- دروست کردنی قوتابخانەو دانانی مەنهەجی ئیسلامی تیایاندا.
٤- وەرگێڕانی کتێبە ئیسلامی یەکان.
٥- یەکخستنی کۆمەڵەو ڕێکخراوە ئیسلامییەکانتا تواناکان یەکبخرێت.
٦- دروست کردنی بنکەی ئیسلامی بۆ ئەوانەی تازە موسڵمان ئەبن باش شارەزا بکرێن له ئاینی ئیسلام.
٧- پشتگیری کردنی ئافرەتانی موسڵمان.
٨- پێویستە هەندێك قوتابی بنێرن بۆ زانکۆ ئیسلامی یەکانی دەرەوە تابەباشی شارەزا بکرێن بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

# ئازاری موسڵمانانی مالی

مالی ئەکەوێتە باکوری خۆرئاوای کیشوەری ئەفریقا لە باکوری ڕۆژهەڵاتەوەجەزائیرە لە ڕۆژهەڵاتەوە نەیجەر لە باشورەوە بۆرکینافاسۆ و ساحل عاج و کینیا و لە خۆرئاوەوە سەنیگال و مۆریتانیا دەورەی داوە

ژمارەی دانیشتوان : ١١ملیۆن کەسە

ڕۆژی سەربەخۆی : ٢٢-١١-١٩٦٠

پایتەخت : بماکۆ

ئاین : ئاینی ئیسلام لە٩٠٪

سەرەتایی گەیشتنی ئاینی ئیسلام بە وولاتی مالی لەسەدەیی نۆیەمی زاینی یەوە بوولە ڕێگا ی بازرگانە موسڵمانەکانی تاریقی یەکان و موسڵمانە بەربەری یەکانەوە بووە
لە سەدەی یانزەیی زاینی ئاینی ئیسلام بە شیوەیەکی زۆر بەربلاٚوو بلاٚو بویەوە بە هۆی بزووتنەوەی مورابیتی یەکانەوە
لەسەردەمی پاشا مانسا موسا لە ساڵانی ١٣١٢- ١٣٣٧ مالی گەشەیەکی زۆر فراوانی بەخۆیەوە بینی پاشا مانسا موسڵمانێکی سەر ڕاست بوو لەسەردەمی ئەودا مزگەوتی گەورە لەسەرانسەری وولاٚتدا کرایەوە و جگە لەوەی توانی مالی لە ڕووی ڕۆشنیری یەوە زۆر پێش بخات و تیمکتۆ بوو بە یەکێك لە مەڵبەندە ڕۆشنبیری یەکانی کیشوەری ئەفریقاو جیهان

## حاڵی موسڵمانان

وولآتی مالی وەکو سەرجەم وولآتی تری موسڵمانان ئازادی ئاینی بە شیوویەکی کەم تێدا ڕەچاوو کراوە دەستوری وولات دەستورێکی عەلمانی یە هەرچەندە لە سەدا ٩٠ ئەم وولاتە موسڵمانن

موسڵمانانی مالی بەشێوەیەکی ئاشتی لە گەڵ شوین کەوتووی ئاینەکانی تردا ئەژین

لەدەستوری مالی دا هاتووە کە کەوەرگرتنی ئاین ئازادەو بۆ کەس نی یە بەزۆر ئاینی خۆی بسەپێنی یاخود جیاکاری و دەمارگیری یاساغە ولەڕێگەی حکومەتەوە و بێت یاخوود لەلایەن هاولآتی یانەوە بێت

دەسەلأتە عەلمانی یەکەی مالی هەتا ئەوەندە لەگەڵ ئازادی ئاینی ئیسلام دا یە کە زیان لە دەسەلأت نەدات

لە وولآتی مالی ٣٠٠کۆمەڵەی تەبشیری کار دەکەن کەئەم کۆمەلأنە لەوولآتانی ترەوە هاتوونەتە مالی( وەکو فەرەنسا و بەلجیکا و ئەڵمانیا) بە ئازادانەکاری خۆی یان دەکەن و دەسەلأت هیچ ڕێگری یەکان لێ ناکات و ڕێگەش دراوە بە هەر هاولآتی یەك کە ئاینی خۆی بگۆڕێت

ئەگەر تەنها یەك کۆمەڵەی تەبشیری وەربگرین کەلەناوچەیەکی فراوانی وەکودغۆن کاردەکات قوتابی وەردەگرن لە قۆناغی سەرەتایی هەتا ناوەندی بیری ئەگۆڕن پاشان هەموو پارەو مەسروفاتێکی ئەکێشن و پاش ئەوەی بیرو باوەری بەیەکجاری گۆڕا ئەوکات ئەینێرن بۆ وولاتانی دەرەوە وەکۆ فەرەنساو ئینگلتەرا

### بەرژەوەندی فەرەنسا لە مالی

مالی وڵاتیکی ووشکی بیابانی یە بەڵام پڕە لە سامانی سروشتی بەرژەوەندی ووڵاتە زلهێزەکان لەوەدایە کە ئەم ووڵاتە نەکەوێتە ژێردەستی موسڵمانان تا ئەوان خێرو بیرەکەی بخۆن.

مالی خاوەنی نیوەی بەرهەمی ئاڵتونە لەجیهاندا و خاوەنی یۆرانیۆمە کە فەرەنسا بەکاری دینیت بۆ کارگەنەوەوییەکانی و دەریایەکی ئاوی هەیە کە ئیستا بە قورو لیتە پڕبۆتەوە.

فەرەنسا لەسەدەی نۆزدەدا ئەم ووڵاتەی داگیرکرد و تائیستاش سامانی سروشتی ئەم ووڵاتە ئەبات.

# ئازاری موسلّمانان له زنجەبار:

زنجەبار (ناوێکه بە کۆمەڵێك نیوه دورگه ئەوترێت کە سەر بە ولاّتی تەنزانیان لە ڕۆژهەلاّتی کیشوەری ئەفەریقا )،ئەم کۆمەڵە دوورگەیە هەموویان سەربەخۆن له بەڕێوەبردن و دەسەلاّتدا دوو نیوه دوورگەیان لە دوورگەکانیتر گەورەترن بەناوەکانی (زنجەبار و بمبا)دوورگەکانی ترکە لە ٢٧ دوورگە پێك هاتوون وسەرجەمیان بچوکن لە دەوری دوورگەی (بمبا)ن و نزیکە ی ٣٥ کیلۆمەتر دوورن لە کەناراوەکانی ڕۆژهەلاّتی ئەفریقا و بەرامبەر تەنجانیقان.

زنجەبار دوورگەیەکی زۆر جوان و سەرنج ڕاکێشه وەکو باخێکی ڕازاوەی پڕ له گولّ و گولّزاره،ڕازاوەتەوه به داری مێخەك و پڕه له کانی و ئاوی سازگارو شیرین لە کیشوەرەی ئەفەریقادا بە گولّستانی ئەفەریقا ی ڕۆژهەلاّت ناسراوه. دوورگەی زنجەبار درێژی یەکەی ٨٥ کیلۆمەتره و پانی یەکەی ٤٠ کیلۆمەتره.

پایتەخت .کنمکمزنجبار

ژمارەی دانیشتوان ( ١٠٧٠٠٠٠)

ئاین .ئیسلام له ٩٨ ٪ موسلّمانن

له ٢٪ مەسیحی و هیندۆسن

زمان . لەسەردەمی عەمانی یەکان زمانی عەرەبی زمانی فەرمی بوو دوای داگیر کاری بەریتانی زمانی ئینگلیزی و زمانی ساحیلی (کەنار دەریا) بەکاردێنن:

باری ئابوری زنجەبار:

خاکی زنجەبار زۆر لەبارە بۆ کشتوکاڵ کردن بەتایبەت بۆ برنج و تەڵح و مەۆغۆ و گێزەر و زیاتر لە چوار ملێون دار مێخەکی لێ یە لەبەرهەمی مێخەکا لەپێش هەموو دنیاوەن،جگە لە بەهارات و فانێلا و گەشت و گوزار و ڕاوکردنی ماسی لەبەر ئەوەی دەورە دراوان بە ئاو لەناو زنجەبار چەند ڕووبارێکی پێدا ئەڕوات گەورەترینیان مویرایە،بۆیە زۆربەی خەڵکی زنجەبار سەرچاوەی داهاتیان لەسەر ئەو بەرهەمانەیە.

زنجەبار دەورە دراوە بەم وڵاتانەی خوارەوە:

کینا لە باشوروە لە باکورەوە دارسەلام.

ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی زنجەبار:

لە کۆتایی سەدەی دەیەمی زاینی شیرازییەکان لە کەنارە ئاوییەکانی ڕۆژ هەڵاتی ئەفریقا چەند ئەمارەتێکیان دروستکرد،لەوانە کیلواو زنجەبار و بمبا و ممباسە. لە ساڵی ١٥٠٣ زاینی بۆ ١٦٩٨ زاینی پروتوگالییەکان زنجەبار یان داگیر کرد.لە ساڵی ١٥٢٨ زاینی زنجەبار لەلایەن ممباسەوە داگیرکرا،دواتر چووە یەکێتی پورتوگالەوە لەبەرامبەر لێخۆشبوونی بەرامبەر بە مکۆس.عەمانی یەکان لە سەردەمی سوڵتان سوڵتانی کوڕی سەیفی یەعربی لەسەرەتای ساڵی ١٦٥٢ زاینی توانییان پرتو گالییەکان دەربکەن و زنجەبار ئازاد بکەن .لە ساڵی ١٩٠٥ تەنازولی کرد لە مەقادیشۆ بۆ ئیتالیا،لە ساڵی ١٩٦٣ تەنازولی کرد لە ممباسە بۆ کینیا.

لە ١٩- ١٢ – ١٩٦٣ سەربەخۆیی وەرگرت لە بەریتانیا.

لە ١٢- یەنایەری -١٩٦٤ عەبید کرۆمی شۆڕشی لە دژی سوڵتان جەمشیدی کوڕی عەبدوڵا بەرپا کرد و دەوڵەتێکی کۆماری دروست کرد

لەو شەڕەدا نزیکە ١٦هەزارکەس کوژراو بە هەزارەها کەس نەفی کران. تەنجانیقا لە گەڵ زنجەباردا یەکێتییەکی فیدراڵیان دروست کرد بە ناوی (کۆماری تەنزانیا یەکگرتوو – تەنزانیا لە ١٢– یەنایەری – ١٩٦٤ لە هەردوو ناوەکە دوو ووشەیان لابرد ناوی یەکێتی یەکەیاننا.

ئیسلام لە زنجەبار:

ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەسەدەیەی یەکەمی کۆچی گەیشتە زنجەبار لە سەردەمی عەبدول مەلیکی کوڕی مەڕوان،کاتێك خەلیفە ویستی دەوڵەتی عەمان بخاتە ژێر فەرمانڕەوای خۆیەوە،ئەو کات عەمان لە لایەن دووبراوە بەڕیوە ئەچوو،ئەو دوو برایە ناویان سلێمان و سەعید کوڕانی جەلەندی بوو.

کاتێك سوپای ئەمەوی بەسەر کردایەتی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی رووی کردە عەمان، فەرمانڕەواکانی عەمان عەمانیان چۆڵکرد و لەگەڵ دەست و پێوەندەکانیان روویان کردە ڕۆژهەلأتی ئەفریقا.

لە دوای ئەم ڕووداوەوە وردە وردە دەسەلأتی عەمانییەکان زیاتر فراون بوونەیەوەو زۆربەی ناوچەکانی گرتەوەو، لە سەردەمی سوڵتان سەعیدی کوڕی سوڵتان ی کوڕی ئیمام ئەحمەد ئەلبوسەعید دوورگەی زنجەبار لاپەڕەیەکی ڕۆشنی هەڵدایەوە.

سوڵتان سەعیدی کوڕی سوڵتان کوڕی ئیمام ئەحمەدی ئەبوسەعیدی لە ساڵی ١٨١٨ زاینی بە کەشتی گەلێکی زۆر گەورەوە ڕوویکردە ڕۆژهەلأتی ئەفەریقا خەڵکی چوونە پێشوازی سوڵتان وکۆمەڵێك بڕیارو هەنگاوی گرنگی دا لەوانە:

١– کاروباری باج و گومرگی ڕێکخست.

٢- گرنگی تەواوی دا بە ڕواندنی دار مێخەك بەجۆرێك زنجەبار لە دارمێخەك بوو بە یەکەم وڵاتی دونیا.
٣- گرنگی دا بە بازرگانی ئاڵتون و عاج برەوەی باشی دا بە دەرهێنانی ئاسن لە کانەکانی بمباسەو لەڕووی بازرگانی قوماشەوە هەنگاوی باشی ناو گرنگی زۆری پێدا.
٤- گرنگی زۆری دا بە دروستکردنی کەشتی گەلی جەنگی بە جۆرێك خاوەنی ٧٥ کەشتی گەورەی جەنگی بوون کە هەر کەشتی یەك ٥٦ تۆپی لە سەر بوو.
٥- ڕوو بەڕووی بازرگانی یاساغی دووڕو مەرجان و گەوهەر بوویەوە هەتا پەیماننامەی لە ساڵی ١٨٢٢ زاینی لەگەڵ بەریتانیا مۆرکرد لەو سەردەمەدا موسڵمانەکان برەوێکی باشیان دابوو بەم بازرگانی یەو وڵاتانی ڕۆژئاواش چاویان تێبڕیبوو.

سەرەتای چاوتێبڕینی زنجەبار:

سەرەڕای ئەو پێشکەوتن و گەشەسەندنانەی کە لەسەردەمی سوڵتان سەعیدی کوڕی سوڵتان زنجەبار بەخۆیەوە بینی،بەڵام بەهۆی نەزانی و فیڵبازی وڵاتە زلهێزەکانی دنیاوە خەریك بوو وردە وردە ئەو ناوچەیەلەکیس ئەچوو. بەهۆی ئەوەی سوڵتان کەوتبووە ئاڵو گۆڕی بازرگانی لە گەڵ ئەمەریکاو بەریتانیا.

ئەو وڵاتانەش خەریکی خۆ بردنە پێشەوە بوون لە گەڵ سوڵتان لەڕێگەی دیاری و بەخشیش و پێدانی پڕۆژەو پێدانی چەك بە سوڵتان تا نیاز پاکی خۆیان بۆ سوڵان نیشان بدەن،لە ژێرەوەش خەریکی جێبەجێکردنی پلانی گڵاوی خۆیان بوون.

چونکه نەریتی ئەو وڵاتە زلهێزانەیە کە چاویان لە سەروەت و سامانی هەموو وڵاتانی دنیایە ئەیانەوێت لە ڕێگەی فرت و فێڵ و خۆبردنە پێشەوە دەستبگرن بەسەر سامانی گەلانی دنیا دا.

بەریتانیا هەنگاوی خێراترینا بۆ دەستگرتن بەسەر زنجەبار و لە پێش دا دەستیگرت بەسەر لایەنی ئابوریدا تا وای لێهات لەڕووی سیاسییەوە باڵا دەست بوو تاکار گەشتە ئەوەی لە ساڵی ١٨٣٤ زاینی ئالاێ بەریتانیا لە زنجەبار هەڵکرا.

لە ١٩ ئۆکتۆبەری ١٨٥٦ سوڵتان سەعید لەسەر کەشتی (فیکتۆریا . وەفاتی کرد ئەم ناوی کەشتی یە بەهۆی ئەونزیکی یەی کە هەیبوو لە گەڵ بەریتانییەکان ئەو ناوەی لیێ نا بوو) لە زنجەبار سوڵتان نێژرا کوڕەکانێ سوڵتان لەسەردابەش کردنی دەسەڵاتی باوکیان بوو بە کێشەیان بەریتانیا دەستوەردانی کرد لە دابەشکردنی دەسەڵاتەکەیان دورگەی زنجەبار بەر یەرعشی کوڕی سوڵتان کەوت،بەڵام بەهۆی ئەم کێشانەوە زنجەبار لە مەملەکەتی ئەلبوسەعیدیە جیا بوویەوەو شێوەیەکی نیمچە سەربەخۆ کاروباری بەڕێوە ئەبرد.

لە سەردەمی سوڵتان عەلی کوڕی سەعید بەریتانیا جاڕی داگیرکاری دا لە نۆفەمبەری ١٨٩٠ ئەمەریکاش دەستی درێژ کرد ویستی پشکی زیاتری دەست بکەوێت ئەم داگیر کاریە ٧٠ ساڵ درێژەی کێشا،دوای ڕزگار بوونیان لە ژێر چنگی داگیر کەران کاری خۆیان دەکرد ئەگەرچی بەڕواڵەت لەوێ نەمانبوون ئەگینا دوای خۆیان کۆمەڵێکیان دانا سیاسەتی وڵاتە داگیرکەرەکانیان پەیڕەو ئەکرد.

### پلانی داگیرکەران و هەڵگەڕانەوە:

دوای تەنها ٩ ساڵ لە سەربەخۆیی، بەریتانیا کەوتە پلانگێڕان بەسیاسەتی (فرق تسود) بەدروست کردنی دووبەرەکی لە نێوان موسڵمانە ڕەگەز جیاوازەکان.وەکو موسڵمانە عەرەبی و شیرازی و ئەفریقی یەکان تا بتوانن موسڵمانان بکەن بەگژ یەکتری دا و سەرقاڵی شەڕی ناخۆیان بکەن و دەسەڵاتی موسڵمانە عەرەبەکان بڕوخێنن.

لە ئەنجامی ئەو دوو بەرەکی یە دوو پارتی سیاسی دروست بوو:

١- حیزبی زنجەباری نیشتیمانی: ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٥٥ دامەزرا و،ئەندام بوون لەم حیزبە بۆ هەموو خەڵکی بوو بە بێ جیاوازیەو یەکەم سکرتێری عەلی موحسین بوو.

٢- حیزبی ئەفرۆشیرازی: ئەم حیزبە ئەندامەکانی لە پێکهاتەی ئەفریقی و شیرازییەکان بوو. سەرۆکی ئەم حیزبە عەبید کەرۆمی بوو لە دامەزراندنی ئەم حیزبە قەشەیەکی مەسیحی زیاتر ڕۆڵی هەبوو بە ناوی جۆلیۆس نیرنیری خەڵکی تەنجانیقا بوو.

٣- حیزبی گەل دواتر دروست بوو بەسەرکردایەتی موحەمەد شامت.

هەڵبژادن کراو حیزبی نیشتیمانی سەرکەوت،دواتر دەرکەوت کە حیزبی ئەفرۆشیرازی نوێنەرایەتی موسڵمانە ئەفریقی و شیرازی یەکان ناکات،بەڵکو کۆمەڵێك خەڵکی خراپ ڕۆڵی تێدا ئەبینن لە

ساڵی ١٩٦٤ دەستیاندایە چەك و دژی حکومەت و گەل بوونەوە هەڵگەڕانەوە یان بە سەر حکومەتدا بەرپاکرد.

ئەو پلانەی دایانڕشت بوو بەم جۆرە بوو:

١- دەستیان گرت بە سەر کەشتییەکەی گەورە بەناوی کەشتی ئیبن خەلدون کە بەرەو مۆزەنبیق ئەچوو ٦٠٠ بەلەمی ڕاوکردنی ماسی تێدا بوو بەهەموو چەك و تەقەمەنیکانییەوە کەوتە دەستیان و لە کاتی هەڵگەڕانەوەکەدا سودیان لێ وەرگرت.

٢- سەرۆکی پۆلیس کە پیاوێکی ئینگلیز بوو سەرجەم پلەدارە و ئەفسەرە موسڵمانەکانی بەخشی بوو کلیلی هەموو مەشجەبەکانی لە سەربازە موسڵمانەکان وەرگرت تا موسڵمانەکان چەکیان دەست نەکەوێت و نەتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن.

٣- حیزبی ئەلفرۆشیرازی خۆپیشاندانێکیان ڕێکخست بەسەرکردایەتی کەرومی و بەرەو کۆشکی سوڵتان جەمشیدی کوڕی عەبدولآچوون،سوڵتان بە ئاستەم دەرچوو خۆی گەیاندە کەشتیەکەی بەریتانییەکان و هەڵهات بۆ بەریتانیا.

لە دوای ئەو خۆپیشاندنە حیزبەکەی کەرومی دەستیان کرد بەکوشتن و بڕینی موسڵمانەکان بە جۆرێك دەستیان لە گەورەو بچوك نەپاراست و نزیکەی ١٦ هەزار کەسیان کوشت و بەهەزارەها کەسیان نەفی کرد.

سەرۆکی حیزبی نیشتیمانی عەلی موحسین بەرگری کرد تا گیراو تا ئێستاش چارەنوسی عەلی موحسین دیار نی یە و نازانرێت چی بەسەر هاتووە.

هۆکارەکانی هەڵگەڕانەوەکە:

زۆر ئەستەمە بتوانرێت ئەو هۆکارانە دیاری بکرێت کە بوونە هۆی دروست بوونی کێشە لە نێوان موسڵمانە ڕەگەز جیاوازەکانی زنجەبار کە نزیکەی سەدەیەك وەکو برا بە خۆشی بەیەکەوە ئەژیان، تەنها هۆکارێك کۆی کردبوونەوەو وەکو برا بەیەکەوە ئەژیان ئەویش ئاینە کەیان بوو، بەڵام ئەو هۆکارانەی لە خوارەو ئاماژەی پێ ئەدەین هۆکار گەلێکن بۆ دروست بوونی کێشەو تێکچونی برایەتی نێوان موسڵمانە ڕەگەز جیاوازەکانی زنجەبار

١- چالاکی تەنصیری :ئەوگروپانەی خەریکی ئەم چالاکی یانە بوون زۆربەی گەورە سیاسەتمەداران بوون بە قوتابیان.

٢- دروست کردنی تۆوی ڕەگەز پەرستی: دروست کردنی ئەم ئافاتە لەلایەن داگیرکەرانەوە بوو کاتێك ئەو درۆیەیان بڵاو کردەوە گوایە موسڵمانە عەرەبەکان خەریکی بازرگانی کردن بە گەوهەرەوە. ئەو پەیمانەی لە لە سەردەمی سوڵتان سەعیدی کوڕی سوڵتان مۆر کرا بوو کە سوڵتان تێدا لە گەڵ بەریتانیا ڕێکەوت بوو کە بازرگانی کردن بە گەوهەرەوە بە هەموو جۆرێك یاساغە کەچی ئەمان پڕو پاگەندەیان بڵاو ئەکردەوەو بە پێچەوانەی ئەو ڕێکەوتننامەیە موسڵمانانیان تاوانبار ئەکرد بە بازرگانی کردن بە گەوهەرەوە.

٣- تەماع و چاو تێ بڕینی دەوروبەر:دەوڵەتە دراوسێکان وەکو کینا و تەنجانیقا دەمێك بوو ئەیان ویست زنجەبار دەربکەن لە ژێر فەرمانڕەوای عەمانییەکان و بیخەنە سەر خۆیان بەتایبەت تەنجانیقا ڕۆڵی هەبوو لە پڕ چەکردنی ئەوانەی هەستان بە کوشت و بڕەکەی ناو زنجەبار.

٤- ویستی ڕۆژ ئاوا : ڕۆژ ئاوا زۆر دەمێك بوو نەخشەی کێشا بوو بۆ بچوك کردنەوەی ئیسلام لە زنجەبار،چونکە زنجەبار دەرگای کیشوەری ئەفریقا بوو وە ئاینی ئیسلام لەوەێوە گەشتبوو بە زۆرێك لەولاتانی ئەفریقای ناوەڕاست و ناوەندی ئەفریقا.

٥- هەڵەی سوڵتان: سوڵتان بە هەڵە مامەڵەی لە گەڵ گروپە تەنصیرییەکان کرد کاتێك دەرگای بۆ خستنە سەر پشت بە بێ چاودێری کردنیان خەریکی کاری تەنصیر کردن بوون.

٦- توندو تۆڵ کردنی پەیوەندی سوڵتان لە گەڵ بێگانە : سوڵتان سەعیدی کوڕی سوڵتان پەیوەندی یەکی توندو تۆڵی بەست لە گەڵ خانەوادەی حاکمی بەریتانیا، بەجۆرێك موسڵمانانی ئەفەریقا کەوتنە گومان لە عەرەبەکان و گومان یان لا دروست بوو،بەجۆرێك سوڵتان و عەرەبەکانیان بە هێنانی داگیر کەران ئەزانی بۆ سەر خاکەکەیان.

## ئازاری موسڵمانان لە زیمبابۆی:

یەکێکە لە وڵاتەکانی کیشوەری ئەفەریقا ودەورە دراوە بەم وڵاتانەی خوارەوە:
باکورو ڕۆژهەڵات مۆزەمبیق. لەباشورەوە باشوری ئەفەریقا لە باشوری خۆرئاواوە بتسوانا وە لەباکوری خۆرئاواوە زامبیا.

ڕووبەری خاکەکەی: ٣٩٠٥٨٠ کلم دووجایە
ژمارەی دانیشتوان: ١٢٣٨٢٩٢٠ کەسە
پایتەخت : هیراری
زمان : زمانی ئینگلیزی و جگە لە زمانی شۆناو ئەدبیل
دراو : دۆلار
لە :١٨- ئەپریل – ١٩٨٠ سەربەخۆیی خۆی وەرگرت لە بەریتانیا

ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی زیمبابۆ:

زیمبابۆ یەکێکە لەو وڵاتانەی کە مێژویەکی دوورو درێژی هەیە، بۆ یەکەم جار هۆزی شۆنا لەسەر خاکی زیمبابۆ نیشتەجێ بوون و یەکەم شاریان دروست کرد بەناوی زیمبابۆی گەورە.لەسەدەی پانزەی زاینی کۆمەڵێك لە هۆزی شۆنا جیا بوونەوە بەناوی کارانجا،ئەم هۆزە ئیمپراتۆریەتێکی نوێیان دامەزراند بەناوی موانا موتابا،لە ساڵی ١٨٨٨زاینی وڵاتانی ئەوروپا کەوتنە داگیرکردنی باشوری ئەفەریقا.لە ساڵی ١٨٩٣ کۆمپانیای ڕودس ی بەریتانی لە باشوری ئەفەریقا

دەستی گرت بەسەر زۆربەی زەوی و زاری ئەو ناوچەیە و ناوەکەیان گۆڕی بۆ ڕودیسیا.
هەرچەند گەلی زیمبابۆ چەند شۆڕشێکیان بەرپا کرد دژ بەو داگیر کاری یە لە ساڵی ١٨٩٦- ١٨٩٧
وڵاتانی ئەوروپا پێشبڕکێیان بوو بۆ بۆ داگیر کردنی ئەفەریقا دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە خاکەکەی ئاڵتونی تێدایە.هەرێمە یەکگرتووەکان جیابوونەوەی خۆیان لەساڵی ١٨٩٨ڕاگەیاند لە هەردوو ڕودیسیای باشوورو باکور.لە ساڵی ١٩٢٣ ڕودیسیی باشور(زیمبابۆی ئێستا) موستەعمەرەی بەریتانیا بوو،بەڵام حوکمی زاتیان هەبوو.لە ساڵی ١٩٥٣ هەرێمی یەکگرتویان دروست کرد کە لەهەردوو ڕودیسیاو نیاسلاند کە پێکهات بوون لە ڕودیسیای باشورو باکور و زامبیاو نیسلاندو مالاوی. لەسەردەمی داگیرکاری بەریتانیا مامەڵەیەکی زۆر نامرۆڤانەو توند ئەکرا بەرامبەر بە ڕەش پێستەکان تەنانەت ڕێگری چالاکی سیاسییان لێ ئەکرا بۆیە ڕش پێسته کان دوو پارتی سیاسیان دروست کرد بە ناوی زابۆ و زانۆ تابتوانن مافی زەوتکراوی ڕەش پێستەکان بگێڕنەوەو بتوانن ڕەش پێستەکان بەشداربکەن لە حکومەت دا بەڵام حکومەتی داگیرکاری بەریتانی زۆربەتوندی بەرپەرچی ئەو داوا ڕەوایەی ڕەش پێستەکانی دایەوە وهەموو چالاکییەکی سیاسی لێ قەدەغە کردن لە ساڵی ١٩٥٠.
دوای سێ ساڵ واتا لە ساڵی ١٩٥٣ جیابوونەوە دروست بوو لە نێوان ڕودیسیاو نیاسالاند ڕوودیسیا داوای سەربەخۆی ئەکرد.
لە ساڵی ١٩٦٩ کۆمەڵێك شەڕ ڕوویدا لەنێوان سپی پێستەکان کە دەستیان گرت بوو بەسەر حکومەتدا و لە گەڵ ڕەش پێستەکان،دواتر

سپی پێستەکان ناچاربوون دەست بەرداری حکومەت بن بۆ ڕەش پێستەکان.لە ساڵی ١٩٧٩ یەکەم حکومەت لەڕەش پێستەکان دروست بوو بە سەرۆکایەتی نەبیل موزوریوا.هەرچەندە ئەمە کۆتایی نەهێنا بەشەڕو ئاژاوە لەنێوان سپی پێست و ڕەش پێستەکان،دواتر پەیماننامەی ئاشتی مۆرکرا و سەرۆك وەزیران درا بە ڕۆبۆرت مۆجابی.

موسڵمانانی زیمبابۆی دوای داگیرکاری بەریتانی:

لەسەردەمی داگیرکاری بەریتانییەکان سەرجەم مزگەوت و شوێنە ئاینییەکان داخرا بوون و ڕێکرییەکی زۆریان لە موسڵمانەکان ئەکرد بەهەموو شێوەیەك خەریکی کوشتن وبرینی موسڵمانەکان بوون و، زۆرێك لە موسڵمانەکانیان ناچار کرد خاك و وڵاتی خۆیان بەجێبێڵن و ئاوارەی وڵاتانی دراوسێکان بن، بەجۆرێك زیمبابۆی وای لێ هات لە زۆرینەیەکی موسڵمانەوە گۆڕا بۆ کەمینەیەکی موسڵمان و بەهەموو جۆرێك ئەشکەنجەو ئازاری موسڵمانانیان ئەدا.لە دوای دەرچوونی داگیرکەری بەریتانی لە ساڵی ١٩٨٠ باری موسڵمان بەرەو باشی چوو بەتایبەت کە بڕیاری ئازادی ئاینەکاندرا

موسڵمانەکان ئەم هەوڵانەیان دا:

١- موسڵمانەکان دەستیان کرد بەکردنەوەی سەرجەم مزگەوت و قوتابخانە ئاینی یەکان کۆلێژی دارعیلم کرایەوە لەگەڵ زانکۆی هیراری لە پایتەخت.
٢- دەستکرا بەوەرگێڕانی کتێبی ئیسلامی .
٣- قوتابخانەی ئیسلامییان لە زۆرێك لە ناوچەکانی زیمبابۆی کردەوە چونکە پێشتر لە ٩٠٪ مندالی ڕەش پێستەکان نەخوێندەوار بوون.

٤- دەستکرا بە بانگەواز بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام و پێشوازییەکی زۆر باش کرا لە بانگەوازی ئیسلامی بەجۆرێك لەڕۆژێك دا ٣٠٠ کەس موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند.

٥- هەوڵ درا بۆ گێڕانەوەی سەرجەم باخ و کێڵگە داگیر کراوەکان کە پێشتر لێیان زەوت کرا بوو،ئەمەش حاڵی موسڵمانەکانی گۆڕی کە پێشتر بەزۆر هەژار کرابوون لە کرێکارەوە گۆڕان بۆ خاوەن کار.

٦- بازرگانە ئاسیاییەکان کە زۆربەیان موسڵمان بوون پرۆژە بازرگانییەکان یان خستە ناوچەی موسڵمانەکان ئەمەش هۆکارێکی باش بوو کە بێکاری زۆر کەم کردەوە لە ناو لاوانی موسڵمانان کە پێشتر بەدەست بێکاری یەوە ئەیانتالاند.

٧- هەوڵدرا موسڵمانەکان فێری زمانی عەرەبی بکرێن تا چاکتر لە ئیسلام بگەن.

## ڕێگری بەردەم بانگەوان:

هەرچەند کوفری عالەمی ئەیانەوێت خۆری ئیسلام بە فوی دەمیان بکوژێنەوە، بەڵام هەموو هەوڵەکان یان مایە پووچ ئەبێت چونکە ئەم ئایینە خوای باڵا دەست خاوەنیەتی. بەسەدەها کۆمەڵەی تەنصیری لە کیشوەری ئەفریقا خەریکی بانگەوازن بۆ ئاینی مەسیحی بەو هەموو پارەو پوولەی هەڵیان ڕشتووە بۆ لەخشتەبردنی خەڵکی کەچی نەیانتوانیوە بگەن بە ئامانجێکی دڵخۆشکەر . لەو ڕێکخراوانەی خەریکی بەمەسیحی کردنی خەڵکن لە زیمبابۆی (کۆمەڵەی نەدەنی بۆ بڵاوکردنەوەی نەصرانی یەت

.کۆمەڵـەی پـەیامی مەسـیحی ، کۆمەڵـەی ئاشـتی : هاوپـەیمانی مژدەدەری مەسیحی . کەنیسەی چاکسازی ئەمەریکی ).
بە ملیارەها دۆلار لەو پێناوەدا خەرج ئەکەن کەچی بە پێچەوانەوە خەڵکی زیمبابۆی زیاتر ڕوو ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەکەنەوە

له كۆتاییدا...

وپاسی مامۆستا عەبدوڵڵا گەرمیانی دەكەین كە ئەركی پێداچوونەوەی كتێبەكەی گرتە ئەستۆ.

- پرۆژەی مەشخەڵی ڕێ، تروسکایی ئومێدە، بۆ ڕۆشنکردنەوەی لارو لەوێریی ڕێچکەکانی لائیك و بێخوایی.
- چلچرای ڕێبازی ئیسلامەتیە، لەئان و ساتێکدا، کە غەربزەدە و هەوادارانی، شەویان ناوەتە سەر ڕۆژ و لەهەوڵی بەردەوامدان، بۆ سەرلێتێکدان و شێواندنی ناسنامەی ئیسلامەتی و کوردایەتی.
- نەخشەی ڕێیە لەپرسەکانی هزر و بیروباوەڕ و ئاکار و ڕەفتاردا.
- شڵەقاندنی گۆمی مەنگی سڵەمینەوە و خۆڵەقاڵبدانە.
- ڕێبەری خودشانازی و توڕدانی قۆناغی متبونە.
- چەخماخەی دیندارانەی سوننەگەرایە، لەهەرکوێیەك بیت، لە خزمەتی تۆدایە.